٢١

المال والحكم في الإسلام

عبد القادر عودة





# سامان و حوكمڕانی له‌ ئیسلامدا

وه‌رگێڕانی: ڕێبوار كوێستانی

تفسیر

**مەبەست لە**

# زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

١. دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

٢. ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداریی و قیامەتی ئیسلامیی پیرۆزن.

٣. شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و رەوتگەرایی.

٤. بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیرورای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت.

﴿ الذّينَ يَستَمعونَ القَولَ فَيَتبَعونَ أَحسَنَهُ، أولئكَ الذّينَ هَداهُمُ اللهُ وَأولئكَ هُمْ أولُوا الألباب ﴾ الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر

# سامان و حوکمڕانی لە ئیسلامدا

نوسینی عبدالقادر عودة

وەرگێڕانی ڕێبوار کوێستانی

لە بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تفسیر / هەولێر

ناوی کتێب بە عارەبی: المال والحكم في الإسلام
نـــــاوی نوســـــەر: عبدالقادر عودة
ناوی کتێـب بەکوردی: سامان و حوکمڕانی لە ئیسلامدا
نـــــاوی وەرگـــــێڕ: ڕێبوار کوێستانی
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
کۆمپـــــــــیوتەر: نوسینگەی تەفسیر
خــــــــــــەت: نەوزاد کۆیی
نـــۆرە و ســاڵی چــاپ: یەکەم ١٤٢٣ک ٢٠٠٢ز
چـــــــــاپکردن: چاپخانەی نازە
تـــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمـــارەی ســـپاردن: ٢١١ ساڵی ٢٠٠٢

تەفسیر
هەولیر - شەقامی دادکا
ت: ٢٢٢١٦٩٥ـ ٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشەکی

سامان و حوکمڕانی دوو پایەی مەحکەمی ژیانی مرۆڤن و، خەم لێخواردن و ڕێکخستنیان، پێویستی یەکی حاشا هەڵنەگرە و، ڕۆڵی گەورە لە چاك ئاراستە کردنی ژیانی مرۆڤدا دەبینێ..

جا لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئیسلام بەرنامە و کەتەلۆکی ژیانی مرۆڤە، بە تێر و تەسەلی لەو دوو بابەتە دواوە و، هـــەموو لایەنەکانی بە وردیی شەن و کەو کردوون، بەڵام حەیفێ زۆربەی موسڵمانان ئاگایان لەو ڕاستییە نییە و، لەو هەموو ئایەت و فەرمایشتانەی لەو بابەتە دەدوێن، بێ خەبەرن.

لێرەوە گرنگی ئەم کتێبە ((بە وەزن سووك و بە قیمەت گران))ەی بەر دەستتان ڕوون دەبێتەوە، کە زۆر بە پوختی و چڕ و پڕیی، ئەو دوو مەسەلەی ساغ و یەکلا کردوونەتەوە، کە خوێندنەوەی وورد و هۆشیارانە پتر ئەوە دەسەلمێنێ و، خوا یار بێ، سەرباری بچوکییەکەی، کەلێنێکی گەورە دەگرێت

وەرگێڕ

٢٣/٢٤-٢-٢٠٠٢

# پێشەکی نووسەر

الحمد لله نستعينه و نستغفره و نعوذ به من شرور انفسنا و من سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له، و من يضلل فلا هادي له.

و الصلاة و السلام على سيدنا محمد عبده و رسوله الذي ارسله بالهدى و دين الحق ليظهره على الدين كله و لوكره الكافرون.

دوای ئەوە :

بێگومان موسڵمانان لە هەموو شوێنێکی دنیا دا، ئێستا دەربارەی ئیسلام نەزانن و، لە ڕێبازە ڕاستەکەی لایانداوە، تەنانەت لە هەموو جیهاندا وڵاتێك نەماوە، ئیسلام –وەکوو خوا ناردویەتی–ی تێدا جێبەجێ بکرێت، چ لە حوکم و سیاسەتدا، یان لە ئابوریی و کۆمەڵایەتیدا، یان لە هەر شتێکدا پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی تاك و کۆمەڵەوە هەبێت و، سیستەمی کۆمەڵی لەسەر بنیات بنرێت و، داوای چاك کردن و بەختەوەریی بکات.

موسڵمانان ڕۆژ بە ڕۆژ لە ئیسلام لایان دا، تا دەستیان لە حوکمەکانی هەڵگرت، ئەو جار بە گوێرەی ئارەزوو و سوودی خۆیان، چەند حوکمێکیان هەڵبژاردن، ئەوەش بووە هۆی بەرەڵایی و فەساد و، سەر ئەنجام وڵاتەکانیان پڕ بوون لە خەراپە و تاوان و، کۆمەڵەکانیان تووشی کوێرەوەری و بەد بەختی بوون، لە ژێر سێبەری ئەو مەینەتەشدا کە تووشی ئیسلام هات، بانگبەرانی ڕاستەقینەی ئیسلام سەریان هەڵدا و، خەڵکیان بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە بانگ کرد و، لاوانیان لە سەر پەروەردە کردن و، هەموو موسڵمانێکیان واڵێ کرد بە کردار و گوفتار و ژیانی، ببێتە بانگبەری ئیسلام و، لە سەر ئەو

تاقیکردنەوانەی تووشیان بوون، ئارامیان گرت تا خوا دەرووی لێ کردنەوە، لەمەوە هۆشیاری ئیسلامیی بڵاو بۆوە و، موسڵمانان بە خەبەر هاتن و، هۆشمەندان دڵنیا بوون ژیانی موسڵمانان بێ ئیسلام هیچ نییە و، چاك بوونی حاڵ و باڵیان و بەختەوەرییان، نایێتە دیی هەتا بۆ ئیسلام نەگەڕێنەوە و کاروباریان لەسەر ئیسلام بنیات نەنێن و، لە هەموو ئیشێکیاندا کاری پێ نەکەن.

ئێستاش موسڵمانان لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیان بە زانینی ڕاستییەکانی ئیسلامە، چونکە ئیمپریالیزم و کۆمۆنیزم[1] تێیان بەر بوون و، دیموکراسی[2] و سۆشیالیزمیان لەبەر چاوان ڕازێنراوەتەوە.. پێویستیان بەو شتەیە تا بزانن تەنها ئیسلام لە ئیمپریالیزم و کۆمۆنیزم قوتاریان دەکات و،تەنها ئیسلامیش دەتوانێ دادپەروەریی و یەکسانی و ئازادیی لە وڵاتەکانیان بە دیی بێنێ..

جا لەسەر هەموو موسڵمانێکی بە توانا پێویستە ئەو حوکمانەی ئیسلام کە لە موسڵمانان شاراونەتەوە، بۆیان ڕوون کاتەوە و بە زمانێکی ئاسان کە تێی بگەن و بە شێوازێکی نوێ قبووڵی کەن، بۆیان بخاتە ڕوو.

ئەمنیش هیوادارم لەم کتێبەدا ئەو شتەی پێویستە هەموو موسڵمانێك لەمەڕ بیردۆزەی ئیسلام دەربارەی حوکمڕانی و، شێوازی لە ڕاوێژدا بیزانێت،

---

[1] ئەم کتێبە بۆ یەکەم جار لەساڵی ١٩٥١ دا لە چاپ دراوە و، ئەو کاتە کۆمۆنیزم لەو پەڕی بە هێزیدا بوو.(وەرگێڕ)

[2] مەبەستی نووسەر لەم (دیموکراسی)یە، ئەوەیە مرۆڤ بەپێی دەستوری پەرلەمان و هەڵبژادن، بۆ خۆی یاسا و دەستور بۆ خۆی دادەنێت و، ملکەچی ئەو یاسا دەستکردە دەبێت، نەك ئازادی بیروڕاو بۆچوون، کە خەڵکی کوردەواری پێی دەڵێن: دیموکراسی، چونکە ئازادی ڕا دەربڕین و تەعبیر لە خۆکردن، کاکڵی ئیسلامە و، مێژووش پڕە لە بەڵگەی سەلماندنی ئەم قسەیە.(وەرگێڕ)

پێشکێشی موسڵمانانم کردبێت، هەروەها هیواداریشم موسڵمانان دوای شارەزا بوون لەم کتێبە، بزانن کە شێوازی ئیسلام لە حوکمڕانیدا لە دنیا دا تاقە و، بیردۆزە دەستکردەکانی ڕاوێژ لە چاو بیردۆزەی ئیسلام هەر شایانی باس کردن نییە.

لە خواش داواکارم هەموو لایەکمان بۆ خێر و چاکە سەر بخات و، بە هۆی ئیسلامەوە یەك دەنگمان بکات.

**عبد القادر عودە**

# بەدیهێنان و بەردەست کردن

- ئەم گەردوونە خوا دروستی کردووە
- ئەم گەردوونە بۆ مرۆڤ بەردەست کراوە
- مرۆڤ هەندێکیان بۆ هەندێکیان بەردەست کراون

# ئەم گەردوونە خوا دروستی کردووە

ئەم گەردوونەی تێدا دەژیین و ئاوەدانی دەکەینەوە و، دەستمان بەسەر ئەو حەیوان و ڕووەك و شتە نازیندوانەدا کە تێیداین، هەڵگرتووە هەوڵی بەدەست هێنانی خێر و بێرەکەی دەدەین و، ئەو هێزانەی لە نێویدان، دەیانخەینە کار، ئەم گەردوونە مرۆڤ دروستی نەکردووە و دەستکردی وی نییە و، مرۆڤ ناتوانی نە ئەم گەردوونە و نە شتی کەمتریش بە دەست بێنێ و، ڕۆژێك لە ڕۆژان شتی وایان لێ نەوەشاوەتەوە و ناوەشێتەوە، چونکە مرۆڤ بۆ خۆی وەکو هەموو دروست کراوێکی دیکە، خوا دروستی کردووە ﴿بَلْ أَنْتُمْ بَشَرٌ مِمَّنْ خَلَقَ﴾المائدة:١٨، دروستکراوەکانیش هەرچەندە هەموشیان پشتی یەکدی بگرن، توانای بەدی هێنانیان نییە و، ئەگەر تێکڕای مرۆڤەکان بۆ دروست کردنی بێ نموودەترین و لاواز ترین مێش کۆبنەوە، لە دەستیان نایەت و، ئەگەر لاوازترین و بێ نموودەترین مێش شتێکیان لێ بستێنێ، ناتوانن ڕێی لێ بگرن و لێی بستێننەوە ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ: لەخوا بەدەر ئەوانەی هانایان بۆ دەبەن، ئەگەر هەموویان کۆبنەوە ناتوانن مێشێك وەدیی بێنن و، ئەگەر مێشیش شتێکیان لێ بفڕێنێ، ناتوانن لێی بستێننەوەو، داواکار و داواکراو کەنەفت و زەبونن.﴾الحج:٧٣.

ئەم گەردوونە تێیدا دەژین و بە ئاوادان کردنەوەیەوە خەریکین، ئەو خوایە دروستی کردووە، کە خەڵکی لەگەڵ دروست کردووە، ئنجا گەردوونی بە مرۆڤ و لە شێوەی نێر و مێدا ڕوخساری جوان کردوون و، گوێ و چاو و دڵی پێ داون تا ڕامێنن و بیر بکەنەوە و، نیعمەتەکانی خوایان بە بیردا بێن و، لەسەر

ئەوەی کە خوا دروستی کردوون و رۆزیی پێبەخشیون و چاکەی لەگەڵدا کردوون، سوپاسی بکەن ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا: خودا ئێوەی هەوەڵ لە گڵ، پاشانیش لە تنۆکەیەك وەدی هێنا، دوایی جووتی لێ پێکهێنان.﴾فاطر:١١. ﴿يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ(٦)الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ(٧)فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ: ئەی بنیادەم، چی تۆی لەحاند پەروەرندەی بەخشندەت بادی هەوا کرد؟ ئەوەی کە دروستی کردی و ئەندامەکانی وێخستی و رێکی کردی. بە هەر شکڵێکیش خۆی ویستی دەری خستی.﴾الأنفطار:٥-٨. ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ: ئەو بیچمی بەئێوە داوە، لەهەموو بیچمێك جوانترە.﴾غافر:٦٤. ﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَالأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ: خوا ئێوەی لە زگی دایکتانەوە هێناوەتە سەر دنیا کە هیچتان نەدەزانی و، گوێ و چاو و دڵی پێ بەخشین، تا سوپاسی بکەن.﴾النحل:٧٨.

ئەو گەردوونەی کە تێیدا دەژین، خوای باڵادەست دروستی کردووە، کە هەرچی دەیزانین و نایزانین و هەستی پێدەکەین و هەستی پێناکەین و، هەرچی دەکرێ بە بیرمان دا بێت و پەی پێ بەرین هەر ئەو دروستی کردووە ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ: ئەوە پەروەردگارتانە، بێجگە لەوی چ پەرستراوی دیکە نین، وەدیهێنی هەموو شتێکە، جا بیپەرستن.﴾الأنعام:١٠٢.

هەر ئەویش ئاسمانەکان و زەویی و ئەو دروستکراوانەی تێیاندان و ئەو هەموو تەنە ئاسمانییانەی لە نێوانیاندان و ناکەونە نێو جوغزی زانست و لە باس کردن و ژماردن نایەن، دروستی کردوون و، هەر ئەویش- ئەگەر بیەوێ- دەتوانێ شتی دیکەش دروست بکات، چوونکە بەدیهێنان و دروست کردن بە ویستی ئەوەوە بەندە و، بناوانەکەی فەرمانی وی یە ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ

**وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ: ملّکایەتی‌ی عاسمانان و زەویی و هەرچیان لە نێواندایە، سەر بە خوایە و، چی پێ خۆشبێ، وەدیی دێنێ.﴾المائدة:١٧. ﴿لِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ: عاسمانەکان و زەمین و هەرچی لە نێویاندایە، سەر لەبەری ملّکی خوایە.﴾المائدة:١٢٠.**

**هەر ئەویشە هەموو جۆرەکانی ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ و هەر شتێك کە شارەزاییمان دەربارەی هەیە، یان هیچی لێ نازانین، دروستی کردووە، وای کردووە بۆ پیتاندن وئاوس بوون، پەیوەندی پێکەوە بکەن و، بۆ پاراستنی جۆر و هێشتنەوەی ژیان، بەر و وەچە (جیل) یان لێ بکەوێتەوە ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لاَ يَعْلَمُونَ: خودا پاك و بێ عەیبە کە هەمو جووتێکی وەدیی هێنا، چ لەوانەی لەم سەر زەمینە دەڕوێن و، چ لە خۆیان و، چ لەوانەش کە نایزانن.﴾یاسین:٣٦.**

**هەر ئەویش تاریکیی و ڕووناکیی بەدیی هێناوە و، شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی دروست کردووە و، تاریکیی بە شەو و ڕووناکیی بە ڕۆژەوە بەستۆتەوە و، خۆری کردۆتە نیشانەی ڕۆژ و، مانگ و ئەستێرەکانی والێ کردووە لە تاریکایی و وشکانی و دەریادا ڕێنومان بن ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی ئاسمان و زەویی دروست کردوەو تاریکایی و ڕوناکایی پەیدا کرد.﴾الأنعام:١.**

**﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ: هەر خۆیەتی شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگی دروست کرد و، هەموویان لە شوێنی خۆیاندا دەخولێنەوە.﴾الأنبياء:٣٣.**

**هەر ئەویش مردن و ژیانی دروست کردووە و، لە دوای مردن مرۆڤەکان زیندوو دەکاتەوە، تا لەو شتەی پێی بەخشیون تاقیان بکاتەوە و، بە گوێرەی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوە ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ**

عَمَلاً: ئەوە کە مردن و ژینی داهێناوە، تا ئێوە تاقی کاتەوە، کامتان ئاکاری جوانترە.﴾ الملك: ٢.

# ئەم گەردوونە بۆ مرۆڤ بەردەست کراوە

ئەو خوایەش کە ئەم گەردوونەی دروست کردووە، بۆ خزمەتی مرۆڤ بەردەستی کردووە و، بە چاو و گوێ و عەقڵ کە پێی بەخشیوە، بەسەر گەردوونیدا زاڵی کردووە و وای لێ کردووە بە یارمەتی ی ئەو شتانەی، خێر و بێری گەردوون بە کاربێنێ و، ئەو هێزانەی تێیدان، بدۆزێتەوە و، هەموو ئەوانە لە پێناوی سوود و بەختەوەریی خۆیدا بە کاربێنێ ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً: ئاخۆ ئێوە نەتاندیوە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆ ئێوەی بەردەست کردوەو، بە ئاشکرا و بە نهێنی نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا رژاندوون؟!﴾لقمان: ٢٠.

جا مرۆڤکە لەسەر زەوی دەژیێ خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆی بەردەست کردووە، هەروا هەرچی لە وشکانی و دەریادایە، هەور بۆ خزمەت کردنی بەردەست کراوە، ئەو ئاوەی لە دەریا و رووبارەکانەوە لە شێوەی هەڵم کۆکراوەتەوە، هەڵی دەگرێ و دەیکاتە باران و، زەویی رووتەنی مردووی پێ دەژیێنێتەوە و، هەموو جۆرە بەر و بوومێکی بۆ بژێو و رۆزیی بەندەکان لێ دەروێنێ، دەریا و رووبارەکانیش بۆ خزمەتی مرۆڤ بەردەست کراون، هەوریان لێ پێکدێت و، رووەك و مرۆڤ و هەموو ئاژەڵێك لەسەر ئاوەکەیان دەژیێ و، کەشتییان پێدا دەرۆن کە خەڵك دەبەنە ئەو شوێنانەی وا نەبایە نەیاندەگەیشتنێ، هەروا لە نێو ئەو دەریا و رووبارانەدا، جۆرەها زیندەوەری دیکە دەژێت، کە خەڵك بۆ خۆراك و رازاندنەوە بە کاریان دێنێ،

خۆر و مانگیش بۆ خزمەتی مرۆڤ بەردەست کراون، ڕووناکیی و گەرمیی دەبەخشن و لە پێداویستیەکانی ژیانن و، هەر شتێکی لە گەردوون دایە لە بچوك و گەورە و زانراو و نەزانراو، بۆ خزمەتی مرۆڤ بەردەست کراوە و، ماڤ خۆیانە پەی بە نهێنییەکانیان بەرن و، دەستیان بەسەردا بگرن و، ئەوەندەی دەتوانن کەڵکیان لێ وەربگرن، چونکە گەردوون بە یاریی خوا بۆیان ڕام کراوە و، ئەوان بە فەرمانی خوا دەسەلاتیان بەسەریدا دەشکێت ﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ(١٢)وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ: خوا ئەوەیە کە دەریای بۆ ئێوە بەردەست کرد کە لە گوێرەی فەرمانی ئەو گەمی لەنێودا بگەڕێ و، بۆ-وەدەست هێنانی- خێر و بێری وی تێبکۆشن و، سوپاسی بکەن. هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەمووی نی ئەوەو، بۆی بەردەست کردوون، کە لەمەدا نیشانە و بەڵگە زۆرن بۆ ئەوانەی ڕادەمێنن.﴾الجاثية:١٢-١٣.

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ(٣٢) وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ(٣٣) وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّار: ئەو خودایەی ئاسمانەکان و زەمینی داهێناوەو لە حەواوە ئاوێکی داباراندوە، بەروبوی بژێوی ئێوەی پێ دەروێنێ، گەمیەشی داوەتە دەستو-کە هەر بەپێی فەرمانی ئەو-لە زەریادا بێت و بچێ و ئەم هەمو روبارانەشی بۆ رام کردون. خۆر و مانگی بۆ ئێوە خستۆتە بەرکار، وەستان و وچانیان نیە، ئەم شەوگار و ڕۆژگارەشی هەر بۆ ئێوە دەستەمۆ کرد. هەرچی لێتان خواستوە، پێی رەوا دیون. ئەگەر بێنە سەر ژماری چاکەی خودا، لەژماردن دادەمێنن، بەڕاستی مرۆڤ ناهەقیار و سپڵەیە.﴾ابراهیم:٣٢-٣٤.

# مرۆڤ هەندێکیان بۆ هەندێکیان بەردەست کراون

خوای باڵا دەست هەر وەکو چۆن گەردوونی بۆ مرۆڤ بەردەست کردووە، هەروا هەندێك مرۆڤیشی بۆ هەندێکی تر بەردەست کردوون، تا لە کۆمەڵێکدا کە ڕێك و پێك و هاوکاری یەکتر بێت، بژین و، چاك تر بتوانن ئەو گەردوونەی بۆیان بەردەست کراوە بەکار بێنن و سوود لە خێر و بێرەکەی وەرگرن و، لە بنیات نانی ژیانێکی مرۆڤانەی دڵخوازدا بەشداری بکەن ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا وَرَحْمَةُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ: ئێمە بژێوی ئەوانمان لەسەر دنیا بۆ بەشکردوون، هێندێکمان لەچاو هێندێکان پایەبەرزتر کردووە، تا هەندێکیان خزمەتی هەندێکیان بکەن و بەزەیی پەروەردگاری تۆ لەو شتەی کۆی دەکەنەوە چاکترە.﴾الزخرف:٣٢.

خواش بۆیە هەندێك کەسی بۆ هەندێکی دیکە بەردەست کردووە، تا حیکمەت لێزانی یەکەی دیاریی بدات و، لەو شتەی پێی بەخشیون، تاقییان بکاتەوە، جا ئەوەی چاکە بکات، بۆ خۆیەتی و، ئەوەی خراپەش بکات ئەوە لەسەر خۆی دەکەوێت و، ئەوەی کافر بێت، کفرەکەی زەرەر لە خۆی دەدات و، ئەوەی ئیمانداریش بێت، ئیمانەکەی سوود بە خۆی دەگەیەنێت : ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَحِيمٌ: هەر بۆ خۆشی ئێوەی کردە جێنشینانی زەویی و هێندێکتانی بەرانبەر بە هێندێکی تر چەند پلە بردە سەرەوە، تا لەو شتانەی

پێی داون به تاقیتان بکاتەوە، پەروەردگارت هەڵبەت به پەله تۆڵه دەستێنێ و، هەر ئەویشە که له گوناهان دەبووڕێ و دلۆڤانه.﴾الأنعام:١٦٥.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ فَمَنْ كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُ وَلاَ يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ إِلاَّ مَقْتًا وَلاَ يَزِيدُ الْكَافِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلاَّ خَسَارًا: هەر ئەو ئێوەی لەجێگەی پێشینەکانتان-لەم زەمینە- جێکردەوە، جا هەرکەسێك ناسپاس بێت، ناسپاسییەکەی سەری خۆی دەگرێتەوەو، نا سپاسیی نا سپاسان، هەر تووڕەیی پەروەردگاریان پتر دەکات و، بۆ ئەمەگیی بێ ئەمەگان، هەر زیانیان زێدە دەکات.﴾فاطر:٣٩.

خوا بەردەست کردنی هەندێك کەس بۆ هەندێکی دیکەی لەسەر چەوساندنەوە بنیات نەناوە و، خوای بەرز و باڵا زۆر له شتی وا دووره، بەڵکو بەردەست کردنی به تەبیعەت و بارودۆخی توانا و لێهاتووییانەوە بەنده، که لەبەر جیاوازییان له ڕووی به هێزیی و لاوازیی و، زانین و نەزانین و، چالاکیی و سستیی و، گەلێك لایەنی جیاوازیی دیکه که له تەبیعەت و زانیاریی و بارودۆخ و بەڵگەکانیانەوە سەرچاوه دەگرێت، کردوونی به چەند پلەیەکی جیا جیا، ئەمەش ڕێ لەوه ناگرێت که ئەو کەسەی له پلەیەکی نزمدایە، به کردار و ئیمانی بۆ پلەیەکی بەرزتر پێی لا بچێت و، بگاتە سەر ترۆپکی هۆز و نەتەوەکەی، چونکه له ئیســلامدا کردار و ئیمان حیســابه و، خوا کاری هیچ ئیمـانداریك به زایه نـــادات : ﴿أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى﴾ال عمران:١٩٥.

ئەو ئیمانداره ئیشەکەی چاك ئەنجام دابێت و، گەیاندبیه پلەی چاکه (الاحسان) ﴿إِنَّا لاَ نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلاً: ئێمه پاداشتی هەرکەسێکی کردەوەی چاك بکات، بەزایه نادەین.﴾الکهف:٣٠.

خوا بۆ خۆی داینــاوه که کەسێك ئیماندار بێت، ژیانێکی خۆشی بە نسیب کات، ئەوەتا دەفەرموێت : ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ: هەرکەسێك–چ نێر، چ مێ– کرداری باشە و باوەڕداره، هەتا دەژی وا دەکەین بەخۆشی بژی، دیاریشە باشتر لەوەی وا کردوویانە، ئێمە پاداشتیان وێ دەدەینەوه.﴾النحل:٩٧.

هەروا داوا لە موسڵمانان دەکات کار بکەن و بۆ کار کردن هانیان دەدات : ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ: بێژە: دەسا وەکارکەون، کاری ئێوە بە زوێکیزوو لەلای خودا و پێغەمبەری و خاوەن باوەڕان دیار ئەدا.﴾التوبة:١٠٥.

پلە و بەرزیی و نزمییەکەشیانی، بە پێی کردەوەکانیان داناوه، جا ئەو کەسەی کارەکەی بەرزی کاتەوه، هیچ شتێك نزمی ناکاتەوه و، هیچ شتێك بەرزی ناکاتەوه: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِمَّا عَمِلُوا وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ: بۆ هەرکەسێك–بەرانبەر بە ئاکاری خۆی– پلەوپایەگەلێك هەیە و، پەروەردگارت لەوەی دەیکەن، خافڵ نییە.﴾الأنعام:١٣٢.

# جێنشینی لەسەر زەوی

- مرۆڤ کراوەتە جێنشین لەسەر زەوی
- جێنشینی مرۆڤ بەچەند شتێکەوە بەندە
- جۆرەکانی جێنشینی
- دەستووری خوا لە جێنشینی حوکم دا
- چەند نموونەیەک لە جێنشینانی پێشوو
- پایەی جێنشینانی سەرزەوی
- ئەرکەکانی جێنشینانی سەرزەوی
- سزای بەزاندنی سنوورەکانی جێنشینی

# مرۆڤ كراوەتە جێنشین لەسەر زەوی

خوا مرۆڤی له زەویی دروست كردووه و، زەویی پیّ ئاوەدان كردۆتەوه : ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاكەی وەدی هێنان و ویستی ئاوەدانی بكەن.﴾هود:٦١. كەواته دەكریّ بڵێین: شوێنی مرۆڤ لەسەر زەویی، شوێنی ئەو كەسەیه كه زەویی ئاوەدان دەكاتەوه و، دەستی بەسەر دا دەگرێت و، زەویی و هەرچی تێیدایه بۆیان بەردەست كراوه و، به ئیزنی خوا بۆیان ڕام كراوه و، ماف و ئەركەكانیان، ئەو خوایەی زەویی پیّ ئاوەدان كردوونەتەوه و، مافی دەست به سەر داگرتنی داونەتیّ، دیارییان دەكات، بەڵام ئێمەش پێمان چاكەوەكوو چۆن خوا زیاتر له جارێك سیفەتی جێنشینییان دەداته پاڵ پێیان بڵێین: جێنشین.

قوڕئانیش ڕاشكاوانه دەڵێت : خوای گەورە ئادەمی بابه گەورەی مرۆڤ دروست كرد، تا بیكاته جێنشینی سەر زەویی : ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: ئەو كاتەی پەروەرندەی تۆ به فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەویّ بریكارێك لەسەر زەمین دیاریی بكەم، گوتیان: تۆ كەسێكی وا دێنی لەوێدا خراپه بكا و خوێن بڕێژیّ؟ كەچی ئێمه هەر شوكرانەی تۆ دەكەین و تۆ به پاك ڕادەگرین! گوتی: ئەوەی من دەیزانم، ئێوه ئاگاتان لیّ نییه.﴾البقرة:٣٠.

دەربارەی چۆنیەتی‌ی جێنشینیی مرۆڤ، توێژەرەوانی قورئان ڕای جیا جیایان هەیە،[1] هەندێکیان پێیان وایە مرۆڤ بۆتە جێنشینی دروست کراوێکی پێش خۆی کە لەسەر زەویی نیشتەجێ بووە و، خراپە و خوێن ڕێژیی تێدا کردووە، لێرەوە بە گوێرەی ئەو ڕایەی، جێنشینیی جێگرتنەوەی دروستکراوێکی پێشووە. هەندێکیش لەو بڕوایەدان مەبەست لە جێنشینیی خوای گەورەیە، نەك دروستکراوێکی پێشوو و، خوا مرۆڤی کردۆتە سەرداری زەویی، تا دەستوورەکانی خوای تێدا ئەنجام بدات و، دەستکردە سەیرەکانی و، نهێنی یەکانی بە دیهێنانی و، شاکارەکانی حیکمەت و لێزانیی و، سوودی ئەمرو فەرمانەکانی ئاشکرا کات و، لەمەودوا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەو جیاوازییە هیچ بایەخێکی لە باسەکەی ئێمەدا نییە.

## جێنشینیی مرۆڤ بە چەند شتێکەوە بەندە

قسەی لەسەر نییە کە خوا کاتێك مرۆڤی لەسەر زەویی نیشتەجێ کرد، لە سەری پێویست کرد گوێ ڕایەڵی فەرمانی بێت و، ئەوەی لێی قەدەغە کردووە، نەیکات و، پەیمانی لێ وەرگرتوون هەر ئەو بپەرستن و هەر لەو بترسن و، خۆیان بە تەقوا و لە خوا ترسان بڕازێننەوە و، وریای فیتنە و فێڵی شەیتان بن و، پێی ڕاگەیاندوون کە ئەوەی بە دوای ڕێڕەوی خوا بکەوێت، ئەوە لەسەر ڕێی ڕاستە و، ئەوەی ئیمان بە نیشانەکانی خوا نەهێنێ و باوەڕ بە نێرراوەکان نەکات، گومڕا و سەر لێ شێواوە و، ئەوانەی لەسەر ڕێی ڕاستن، ئۆقرە و ئارامیان پێ دەبەخشێت و، نەترسی دایان دەگرێت و نەخەمبار دەبن و، بۆ کافر و بێ

[1] تەفسیری (المنار) ج ١ لاپەڕە (٢٥٧-٢٦١)

**باوەڕانیش ئاگری هەتا هەتایی داناوە :** ﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ(٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ: **گوتمان هەمووتان لە بەهەشت بڕۆنە خوارێ، ئەوسا ئەگەر لای منەوە ڕێنوێنیێکتان بۆ هات، ئەوانەی بکەونە شوێنی ڕێنوێنیم، نە لە هیچ شتێك دەترسن، نە خەم دەخۆن.**﴾البقرة:٣٩،٣٨.

﴿قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَى حِينٍ(٢٤)قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ(٢٥)يَابَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ(٢٦)يَابَنِي آدَمَ لاَ يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ(٢٧)وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ(٢٨)قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ(٢٩)فَرِيقًا هَدَى وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلاَلَةُ إِنَّهُمْ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ مُهْتَدُونَ: **گوتی: داگەڕێنە خوارێ، ئێوە دوژمنی یەکدین، تا ماوەیەك جێگا و مایەی ژیانتان لە زەویی دەبێ. گوتی: دەوێدا دەژین و، لەوێش دەمرن، هەر لەوێش دەوهێننە دەر.. ئەی فرزەندەکانی ئادەم، ئێمە جلکی وامان داونێ، کە عەیب و عارتان داپۆشێ و جوانیشتان کا، چاکتر لەویش، پۆشاکی خۆپارازتنە، ئەمەش یەکێك لە نیشانەکانی خوایە، بەڵکو بیر بکەنەوە.. ئەی کوڕانی ئادەم، شەیتان نەتانخەڵەتێنێ، هەروەك باوك و دایکتانی لە بەهەشت بەدەرکردن دا و، جل و بەرگی لێ داڕنین تا شەرمی خۆیانیان نیشان بدا. شەیتان و دەستە و بەستەکەی، لەلایەکەوە دەتانبینن، کە ئێوە ئەوان نابینن.. ئێمە شەیتانیەکانمان کردوونەتە دۆستی ئەوانەی بڕوایان بە خودا نیە.. هەرکاتێك**

کارێکی خراپی ئابڕووبەرەیان لێ روبدات، دەڵێن: ئێمە باب و باپیری خۆمان دیوە، کە هەر وایان کردووەو، خودا فەرمانی پێداوین ئاوا بکەین. بڵێ: خودا بۆ کاری بەد فەرمان نادات، ئایا ئێوە بە زمانی خوداوە شتێك هەڵدەبەستن، کە نایزانن؟! تۆ بڵێ: پەروەردگارم فەرمان بە دادپەروەریی دەکات. لە هەموو مزگەوتێکدا ڕوو لە خوا کەن و، بەدڵێکی پاك لەبەری بپاڕێنەوە، وەك بەریێ ئێوەی دروست کرد. گشتو بۆ لای ئەو دەچنەوە. هێندێکیانی شارەزای ڕێگا کردووەو، دەستەیەکیش هەر شیاوی گومڕابونن، کە ئەوانە لەبری خودا دەگەڵ شەیاتین بوونە دۆست، لایان وایە شارەزا هەر بۆخۆیانن.﴾الأعراف:٢٤-٣٠.

بەیانیش خوا لەسەر لاڕێ بوون و گومڕایی حیساب لەگەڵ مرۆڤ دەکات، هەروا لەسەر دەست هەڵگرتنی لە گوێڕایەڵیی خوا و شوێن کەوتنی شەیتان و، لێیان دەپرسێتەوە و هیچ بیانوویەکیشیان بە دەستەوە نییە، ئەنجا لە سزای ئەوەی سەرپێچی فەرمانی خوایان کردووە و، باوەڕیان بە نیشانە و بەڵگەکانی نەکردووە و پەیمانیان لەگەڵ شکاندووە، پۆل پۆل فڕێ دەدرێنە نێو ئاگر و، تێنی گەرماکەی دەچێژن : ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ(٦٠) وَأَن اعبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ(٦١)وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنْكُمْ جِبِلاًّ كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ(٦٢)هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ(٦٣)اصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ(٦٤)الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ: ئاخر ئەی تۆرەمەی ئادەم، من لەپێشدا پەیمانم لەگەڵدا نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن؟ ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە و، هەر تەنیا خۆم بپەرستن کە ڕێگەی ڕاست هەر ئەمەیە و، (شەیتان) گەلێك کەسی لەئێوە گومڕاکرد، ئەوە هێشتا هەر تێناگەن؟! ئەمە ئەو جەهەندەمەیە، کەوا بەڵێنتان پێدەدرا. بەهۆی پێنەزانیەکەتان، ئەمڕۆ دەبێ بچنە ناوی.﴾یس:٦٠-٦٥.

# جۆرەکانی جێنشینی

جێنشینیی مرۆڤیش لە سەر زەویی دوو جۆرە : جێنشینیی گشتیی و جێنشینیی تایبەتی.

جێنشینیی گشتیی، جێنشینیی مرۆڤە لەسەر زەویی بۆ ئاوەدان کردنەوە و دەست بەسەردا گرتنی : ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاکەی وەدی هێنان و ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود:٦١.

ئەم جێنشینییە لە ئادەم ﷺ دەست پێدەکات و، لە دوای خۆشی، هەموو تۆرەمە (ذرية) کەی دەگرێتەوە، چونکە هەموویان ئاوەدانکەرەوەی زەوین و، خوای گەورە ئاوەدان کردنەوەی پێ سپاردوون و، زەویی بۆ بەردەست کردوون و بە ئیزنی خۆی بە سەریدا زاڵ کردوون : ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: ئەوکاتەی پەروەردگارت بە فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەوێ بریکارێك لەسەر زەوی دیاریی بکەم.﴾البقرة:٣٠.

جێنشینی تایبەتیش جێنشینیی حوکمڕانی یە، ئەویش دوو جۆرە : جێنشینیی دەوڵەتان و جێنشینیی تاکەکان، جێ نشینی حوکمڕانیش بە هەردوو جۆرەکانیەوە، منەت و چاکەیەکی دیکەیە، خوا لەگەڵ ئەو بەندانەی خۆی کە حەزی لێیە، چ وەك نەتەوە، چ وەك تاك، دەیکات، دوای ئەوەی بە نیعمەت و چاکەی کردنیان بە جێ نشینیی سەر زەوی، منەتی لەسەر کردن : ﴿وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ: بڕیارماندا ئەوانەی لەم زەوییەدا زەبوون کران، بە چاکە وەیانخوێنین و، بیانکەینە پێشەوای خەڵك، لەدواییشدا بۆخۆیان بمێنێتەوە.﴾القصص:٥.

﴿وَجَعَلْنَا مِنهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ: لەوانیشدا چەند کەسانێکمان کردە ڕێبەر، کە هەر بە فەرمانی خۆمان ڕێنوێنیی خەڵك بکەن، چونکە توانای خۆڕاگرتنیان تێدابوو، بەتەواویی باوەڕیشیان بە نیشانانمان هێنابوو.﴾السجدة: ٢٤.

مەبەست لە جێنشینیی دەوڵەتانیش، ڕزگار کردنی نەتەوە و سەر بە خۆ بوونیەتی لە حوکم کردنی خۆیدا و، کردنیەتی بە دەوڵەتێك کە دەستەڵاتی ئەوەی هەبێت بەرژەوەندیەکانی خۆی بپارێزێت و، خاوەنی قسەی خۆی بێت و، مانای دووەمیشی فراوان بوونی دەستەڵاتی دەوڵەتە، تا وای لێ دێ، سەرباری ڕۆڵەکانی ئەو نەتەوەیە، نەتەوە و گەلانی دیکەش بگرێتەوە.

جێنشینیی دەوڵەتانیش، ئەگەر بە ئیزن و فەرمانی خوا بێت، چاکە و خێری خوایە بۆ نەتەوەکان بەڵام دەبێ بزانین کە جێ نشینیی بە چەند هۆیەکەوە بەندە، کە نەتەوەکان دەستیان پێ دەگرن و، پێیان دەگەنە پلەی جێنشینیی و، دەبنە حوکمڕانی سەر زەوییی و، ئەوەش دەستووری خوایە و، دەستووری خواش گۆڕانی بەسەر دا نایەت، چونکە ناگونجێ جێ نشینیی لە خۆڕا بێ کاربۆ کردن بێتە دیی، بەڵکوو لە ئەنجامی کاری گران و هەوڵی بەردەوامدا بە دیی دێت، خوای باڵا دەستیش بەڵێنی بەو کەسانە داوە کە ئیمانیان هێناوە و چاکە کارن، کە بیان کاتە جێنشینیی زەوییی، جا خوا بە تەنها ئیمانی نەکردۆتە هۆی کردنی ئیمانداران بە جێنشین، بەڵکوو قەولی بە ئیمانداران داوە بییان کاتە جێنشین، ئەگەر هاتوو کاری چاکیان ئەنجام دا، مەبەستیش لە کاری چاك هەر کارێکە لە بابەتی گوێڕایەڵیی خواو خۆ لادان لە خەراپە و تاوان، کە کار و باری قیامەتیان چاك دەکات : ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ: خوا پەیمانی بەو کەسانەتان کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردون،

داوه، که بیانکاته جێنشینی سەر زەویی، هەروەکو چۆن خەڵکی پێش ئەوانی کردە جێنشین.﴾النور:٥٥.

کردنی تاکەکانیش بە جێنشین، ئەوەیە کە لە کار و باری سەرکردایەتیدا بکرێنە جێنشین و، ڕەنگە ئەو کەسەی دەکرێتە جێنشین، هەندێك جار ناوی ((خەلیفە))ی لێ بنرێت، هەروەکوو داودﷺ ناوی لێنرا : ﴿يَادَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلاَ تَتَّبِعْ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّ الَّذِينَ يَضِلُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا نَسُوا يَوْمَ الْحِسَابِ: ئەی داود، ئێمە تۆمان کردە جێنشینی سەر زەویی، جا بە گوێرەی هەق و ڕاستی فەرمانڕەوایی لەنێو خەڵکیدا بکە و، مەکەوە دوای هەوا و ئارەزوو، نەبادا لە ڕێبازی خوا لات بدات، چونکە ئەوانەی لە ڕێبازی خوا لادەدەن، بەهۆی لەبیرکردنی ڕۆژی قیامەتەوە، سزایەکی سەختیان هەیە.﴾ص:٢٦.

هەندێك جاریش جێنشین ناو دەنرێ پێشەوا (امام)، هەروەکوو ابراهیمﷺ و هەندێك سەرکردەی بەنی ئیسرائیل ناویان نرا : ﴿وَإِذْ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ: ئەوسا خودا بە چەند وشە ئەزموونی ئیبراهیمی کرد، پێکی هێنان، گوتی: دەتکەمە ڕێبەری خەڵکی دنیا، گوتی: ئەدی تۆرەمەکەم؟ گوتی: ناهەقیکاران وەبەر بەڵێنی من ناکەون.﴾البقرة:١٢٤.

﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ: کردیشمانن بە پێشەوا -کە هەر بەفەرمانی ئێمە- شارەزایی خەڵك بکەن و، بە هەموانیشمان ڕاگەیاند لە کاری چاك نەوەستن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن و، گشتیان ئێمەیان دەپەرست.﴾الانبیاء:٧٣.

جاری واش هەیە جێنشین پێی دەگوترێ پاشا (ملك) : ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَاقَوْمِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنْبِيَاءَ وَجَعَلَكُمْ مُلُوكًا

وَآتَاكُمْ مَا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِنْ الْعَالَمِين: **ئەو دەمانەش کە موسا بە هۆزی خۆی گوت: گەلۆ، نابێ ئێوە هەرگیز ئەو چاکەیە لەبیرکەن کە خوا لەگەڵی کردوون، کە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لە نێو خۆتان بۆ ناردوون، چەندین پاشای لەخۆتان پەیداکردووەو، ئەو شتەی بەشێوەی داوە، لەم دنیایەدا بەکەسی نەداوە.**﴾المائدة: ٢٠.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا: **پێغەمبەریان پێی گوتن: خودا بۆ پاشایەتیتان، تالوتی دیاریی کردووە.**﴾البقرة :١٤٧.

## دەستوری خوا لە جێنشینی حوکم دا

**دەستوری خوای گەورەش لە جێنشینییی دەوڵەتان و تاکەکان دا ئەوەیە کە هەر نەتەوەیەك شایانی جێنشینیی بێ، بیکاتە جێنشینیی و، ئەو تاکانەش کە لێیان دەوەشێتەوە، بکاتە جێنشین، هەمووشی بۆ ئەوەی لەو شتەی پێی بەخشیون تاقیان بکاتەوە:** ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم: **هەر بۆ خۆشی ئێوەی کردە جێنشینانی سەرزەوی، هێندێکیان لە بەرانبەر هێندێك چەند پلە بردە سەرەوە، تا لەو شتانەی پێی داون، بە تاقیتان بکاتەوە.**﴾الأنعام:١٦٥.

**جا ئەگەر ئەوانەی کراونە جێنشین، ڕێك لەسەر فەرمانی خوا ڕۆیشتن و، بانگەوازیان بۆ لای خوا کرد و، بێ هاوتا بۆ دانان لە پەرستندا، پەرستیان و، نوێژیان کردوەو زەکاتیان داوە، کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە، لە خراپەکان دوور کەوتنەوە، فەرمانیان بە چاکە کردو و هەوڵی ڕێگرتن لە خراپەیان دا،** ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا

بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ: ئەوانەی کە هەر کاتێکی دەستەڵاتمان دانێ لەسەر زەویی، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و، فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و، سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بەدەست خوایە.﴾الحج:٤١.

﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ: پێشەوایانمان لەنێودا پەیداکردن، کە بەهۆی ئارام گرتنیانەوە بە فەرمانی ئێمە ڕێنوێنیی خەڵك دەکەن و، بە دڵنیایی باوەڕیان بە بەڵگە و نیشانەکانی ئێمە هەیە.﴾السجدة:٢٤.

﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَةَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِينَ: کردمانن بەو پێشەوایانەی بە فەرمانی ئێمە ڕێنوێنیی خەڵك دەکەن و، پێشمان ڕاگەیاندن لەکاری چاك نەوەستن و، نوێژ بکەن و زەکات بدەن و، گشتیان ئێمەیان دەپەرست.﴾الأنبياء:٧٣.

ئەگەر ئەوانەی کراونەتە جێنشین ئەوەیان کرد، خوا لەسەر زەوی دەسەڵاتیان دەداتێ و، ڕێی دەست پێ ڕاگەیشتنی هەموو شتێکیان پێشان دەدات، هەروەکوو چۆن (ذو القرنين) وە گەلەکەی وا لێ کرد : ﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا، فَأَتْبَعَ سَبَبًا: وامان کرد لەم زەمینەدا دەستی بڕوات و، گشت هۆیەکیشمان بۆ ڕەخساند.﴾الكهف:٨٤.

هەروا، وەك چۆن یوسفی کردە دەسەڵاتداری زەوی وە بە کەیفی خۆی کوێی ویستبا، لێی جێنشین دەبوو کە پێشتر نە بەخەیاڵیداهاتبوو، نە بە خەونیشیدا دێت: ﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ: ئا بەم جۆرە یوسفمان لەم سەر زەمینە-بەڕێزەوە- جێکردەوە، لەهەرجێیەك خۆی ویستبای لەوێ دەژیا.﴾يوسف:٥٦.

وە هەر وەکوو چۆن بەنو ئیسرائیلی کردە دەسەڵاتداری زەوی، سەرەڕای بێهێزی خۆیان و بە هێزی دوژمنەکانیان، دوای ئەوەی فیرعەونەکان کردبوویانن بە کویلەی خۆیان و دەیان چەوساندنەوە، پیسترین ئەشکەنجەیان دەدان و کوڕەکانیان سەردەبرین و ئافرەتەکانیان بۆ خزمەت کاریی دەهێشتنەوە، ئەوە بوو خوای باڵا دەست هێز و دەسەڵاتی دانی و، ڕۆزی و حەڵاڵ و پاکی پێ بەخشین و، هەندێکیان کردە پێغەمبەر و پاشا و، ئەوەندەی پێی بەخشین، کە بە کەسی نەبەخشی بوو: ﴿وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ: بەڕاستی ئێمە بەرەی ئیسرائیلمان لە شوێنێکی خۆش دامەزراند و، ڕۆزیی پاك و چاکمان دانێ.﴾یونس:٩٣.

﴿يَاقَوْمِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنْبِيَاءَ وَجَعَلَكُمْ مُلُوكًا وَجَعَلَكُمْ مُلُوكًا وَآتَاكُمْ مَا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ: گەلۆ! دەبێ هەرگیز ئێوە ئەو چاکەیەی لەبیر نەکەن کە خودا دەربارەی کردون، کە ئەو هەمو پێغەمبەرەی هەر لەناو خۆتان بۆ ناردون، چەندین پادشای لەخۆتان پەیدا کردوەو ئەو شتەی بەئێوەی داوە، بەهیچ کەسی لەم دنیایەدا نەداوە.﴾المائدة:٢٠.

وە هەر وەکوو چۆن گەلی یونس، کاتێك ئیمانیان هێنا، خوا کار و باری لە ژیانی دنیایاندا بۆ چاك کردن و تا ماوەیەك خۆش گوزەرانیی پێ بەخشین و، کردنی بە دەسەڵاتدار : ﴿فَلَوْلاَ كَانَتْ قَرْيَةٌ آمَنَتْ فَنَفَعَهَا إِيمَانُهَا إِلاَّ قَوْمَ يُونُسَ لَمَّا آمَنُوا كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ: بۆچی هیچ شارێك نەبوو کە خەڵکەکەی بڕوا بێنن تا ئەو دەمەی کە بڕواکەیان بەهرەیان پێ بگەیەنێ، بێجگە لە هۆزەکەی یونس؟! کە کاتێك بڕوایان هێنا، ئازاری ئابڕووبەرەمان لەسەر دنیا لێ لادان و، وامان کرد هەتا ماوەیەك خۆش ڕابوێرن.﴾یونس:٩٨.

خوای باڵا دەستیش لە هەموو خەڵکی جیهان بێ نیازە، لەگەڵیان مهرەبانەو، ئەگەر فەرمانی کردن یان نەکردنی شتێکیان پێ دەکات، ئەو بۆ چاکەی ئەوانێتی، سوودیان پێ دەگەیەنێت و، ئەو دەتوانێت بۆ خۆی بێباوەڕان لەنێو بەرێت و، کۆمەڵە خەڵکێکی دیکەیان لە شوێن دانێ و، ئەوەی لا ئاسانە، چونکە ئەوانیش لە پشتی کۆمەڵێکی تر پەیدا بوون : ﴿وَرَبُّكَ الْغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ إِنْ يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنْ بَعْدِكُمْ مَا يَشَاءُ كَمَا أَنْشَأَكُمْ مِنْ ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ آخَرِينَ: پەروەرندەت بێنیاز و دلۆڤانە، ئەگەر خۆی ئارەزو بکات ناتانهێڵێ و حەزێ بکات، لەپاش ئێوە چینێکی دیکە لەجێی ئێوە دادەنێت، هەروەکو چۆن ئێوەی لە تۆرەمەی کەسانی تر خستۆتەوە.﴾الانعام:١٣٣.

جا تا جێنشینەکانی سەر زەوی، ڕێك لەسەر فەرمانی خوا بڕۆن، ئەو لە دەسەڵاتداریێتی و حوکمڕانیدا، لە بەڵێنی خوا بەهرەمەند دەبن و، لە هەموو لایەکەوە بە تێر و تەسەلی ڕۆزیی و بژێویان بۆدێ، تا ئەو کاتەی دەر هەق بە چاکە و نیعمەتەکانی خوا، دەبنە سپڵە و پێ نەزان و بێ باوەڕ بە نیشانە و بەڵگەکانی و، لەڕێی و شوێنی پێغەمبەران لا دەدەن و، سنوور دەبەزێنن و ستەم و دەست درێژی دەکەن و، بە هێز و دەسەڵات و زانیاری لە خۆیان بایی دەبن، ئەو کاتە بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن، خوا لە ناکا و دەیان گرێت و، نیعمەتەکانیان لێ دەستێنێتەوە و، دەوڵەت و دەسەڵاتیان لە نێو دەبات و، کۆمەڵێکی دیکەیان لە جێی دادەنێت، بێ ئەوەی کاتێك فەرمانی خوا بۆ لە نێو بردنیان هاتە دی و ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، توشیان بوو هۆش و زانست و ماڵ سامانیان سوودێکیان پێ بگەیەنێت : ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا الْقُرُونَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ وَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ(١٣)ثُمَّ جَعَلْنَاكُمْ خَلَائِفَ فِي الأَرْضِ مِنْ بَعْدِهِمْ لِنَنْظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ: گەلێك بەرەمان لەپێش ئێوە لەنێو بردن، کاتێك کە ناهەقییان کرد، پێغەمبەران بە

**نیشانی دیارەوە هاتنە لایان، هەر باوەڕیان پێ نەهێنان. ئێمە ئاوا تاوانباران سزا دەدەین.. لەپاش ئەوان ئێوەمان لەم سەرزەمینە جێنشین کرد، کە ببینین کردەوەی ئێوە چۆن دەبێت.﴾**یونس:١٣-١٤.

﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّنْ لَكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِمْ مِدْرَارًا وَجَعَلْنَا الأَنْهَارَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ: **ئەرێ نازانن کە ئێمە لەپێش ئەواندا چەندان بەرەمان قڕکرد؟! ئەو دەستەڵاتەش لەم زەمینە بەوانمان دابوو، بەمانمان نەداوەو، بارانی بەخوڕمان بۆ باراندن و، وامان کرد لەسەر ڕووباران بژین، کەچی هێندە نافەرمانیان کرد، قڕمان کردن و، لەپاش ئەوان-لەجێی وان- بەرەی دیکەمان دامەزراندن.﴾**الانعام:٦.

﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِنْ مَكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلاَ أَبْصَارُهُمْ وَلاَ أَفْئِدَتُهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ: **لەو شوێنەدا گوزەرانێکمان دابوونێ، کە نەمانداوەتە ئێوە، گوێ و چاو و دڵیشمان بەوانیش دابوو، ئەوان لەگوێ و چاو و دڵیان هیچ بەهرەیان وەدەست نەکەوت و، نرخێکیان بۆ نیشانەکانی خوا دانەدەنا و، تووشی ئەو شتە بوون کە گاڵتەیان پێ دەکرد.﴾**الاحقاف:٢٤.

## چەند نموونەیەک لە جێنشینانی پێشوو

**بێگومان چەند نموونەیەکی بۆمان هێناوینەوە، کە پڕ لە پەند و ئامۆژگارین، ئەوەندەی دەنگ و باسی پێشینان بۆ ڕوون کردینەوە، کە بەشی هەموو کەسێکی هۆشمەند بکات، ئەوەتا گەلی نوح، باوەڕیان بە نوح نەهێنا،**

خۆی شوێنکەوتوەکانی یان چەوساندنەوە، جا خوا ئەو لاوازی و بێ دەسەڵاتیانەی کردنە جێنشین و، ئەو بە هێزانەی بە هێز و دەسەڵاتیان خۆیان لێ گۆڕا بوو و، ئەوەندە لە خۆبایی بوون، کە باوەڕ بە بەڵگە و نیشانەکانی خوا نەهێنن لە نێوی بردن : ﴿فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَاهُ وَمَنْ مَعَهُ فِي الْفُلْكِ وَجَعَلْنَاهُمْ خَلَائِفَ وَأَغْرَقْنَا الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنْذَرِينَ: ئەنجا باوەڕیان پێ نەکرد، ئەوسا خۆی و ئەوانەی لە کەشتیەکەدا دەگەڵی بوون، قوتارمان کردن و، کردمانن بە جێنشین لەسەر زەویی و، ئەوانەش کە باوەڕیان بە نیشانەکانی ئێمە نەکرد لە ئاوماندا خنکاندن، دە بڕوانە ئەوانەی ترسێنرابوون چیان بەسەر هات!﴾یونس:٧٣.

(هود)یش بانگەوازی گەلەکەی دەکا بەسەرهاتی گەلی نوحیان وەبیر دێنێتەوە و، لەو کارەساتەیان دەترسێنێ و دەڵێ : ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ: وەبیر خۆتان بێننەوە چۆن خوا دوای ئەوەی گەلی نوحی بە هۆی کردەوەی لە بابەتی ئەو کردەوانەی ئیستا ئێوە دەیکەن، لە نێو بردن، ئێوەی کردە جێنشین﴾الاعراف:٦٨، جا دوای ئەوەی لە چاك بوونیان نائومێد بوو پێی گوتن : ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ مَا أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَيْكُمْ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّي قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُ شَيْئًا إِنَّ رَبِّي عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ: ئەگەر نەیێنە ڕەدایەش،-پێیان بڵێ-: من بە هەرچی ڕاسپێراوم پێم ڕاگەیاندن و، پەروەردگاری من مەردمێتر لەجێی ئێوە دادەنێ و، هیچ زیانیشی لێنادەن. بەڕاستی پەروەرندەم چاودێری هەموو شتە.﴾هود:٥٧.

هەروا ((صالح)) ئەو نیعمەتانەی وەبیری گەلەکەی دێنێتەوە کە خوا پێی بەخشیون و، لە دوای ((عاد)) کردوونی بە جێنشین و، لە مەڕ سەرئەنجامی دەست درێژی و فەسادی سەر زەوی، ووریایان دەکاتەوە : ﴿وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِنْ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِنْ سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا

فَاذْكُرُوا آلاَءَ اللَّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ: لەبیرتان بێ هۆزی عاد، ئێوەی کردە جێنشین و لەسەر زەویی دایمەزراندن، لەپێدەشتان کوشکتان بەرز دەکردنەوەو، لە کێوەکانیشدا خانووتان دەتراشی، نیعمەتی خواتان لەبیر بێ و، ئەو هەموو فەسادیی و بەدکارییە لەسەر زەویی بلاو مەکەنەوە.﴾الاعراف:٧٤.

(موسا)ش، گەلەکەی دێن ئازاردانیان لە لایەن فیرعەونەوە، ئەو دەست درێژی و ستەمی لێی کردوون، لە لا دەکەن، ئەویش مزگێنیان دەداتێ، کە دەستوری خوا هەر دێتە دی و، وەکوو خەڵکی دیکە گوناه و تاوان بکەن: ﴿قَالُوا أُوذِينَا مِنْ قَبْلِ أَنْ تَأْتِيَنَا وَمِنْ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا قَالَ عَسَى رَبُّكُمْ أَنْ يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ: گوتیان: بەر لەوەی ئەتۆ بێی، ئازار دەدراین، کە تۆش هاتووی، هەر وا دەمان چەوسێننەوە! گوتی: ئەو ڕۆژە دوور نیە پەروەردگارتان دوژمنتان لەنێو بەرێت و، ئێوە بکاتە جێنشین لەسەر زەویی و، بڕوانێ ئێوە چۆن ڕەفتار دەکەن.﴾الأعراف:١٢٩.

(قارون) و (فیرعەون) و (هامان)یش، ستەمیان کرد لە سەر زەوی و، بە ناڕەوا و خۆیان بە زل زانی و، نیعمەتی خوایان لە بیر چوو، جا ئەوە بوو ماڵ و سامان و ئەو شتانەی بێ جگە لە خوا دەییان پەرستن، هیچی بۆ نەکردوون، خوا بە هۆی تاوانەکانیانەوە گرتنی، جا ئی وایان هەبوو بومەلەرزە لێی داو و، ئی وا هەبوو بە زەویدا ڕۆ چوو و، هەشیان بوو لە ئاودا خنکێنرا: ﴿وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَلَقَدْ جَاءَهُمْ مُوسَى بِالْبَيِّنَاتِ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ(٣٩) فَكُلاًّ أَخَذْنَا بِذَنْبِهِ فَمِنْهُمْ مَنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ الصَّيْحَةُ وَمِنْهُمْ مَنْ خَسَفْنَا بِهِ الأَرْضَ وَمِنْهُمْ مَنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَكِنْ كَانُوا أَنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ: قارونیش و فیرعەونیش و هامانیش-هەر بەو دەردەچوون-، دیارە موسا گەلێك نیشانەی دیاری بۆ هێنان، بەڵام خۆیان لەم زەمینە لە خەڵکی بە زلتر زانی و، نەشیانتوانی لە دەستی ئێمە دەرباز بن.. ئێمە هەریەك لەوانەمان بە تاوانەکەی

خۆی گرت، جا هەندێکیان بای زۆر توندی پڕ له چەومان ناردنه سەر، هێندێکیشیانت نەعرەتەی زل دایگرتن و، هێندێکیشمان به ناخی زەویدا ڕۆبرد، هێندێکیشمان له ئاودا نوقوم کردن، خوا ستەمی لێ نەکرن، بەڵام خۆیان ستەمیان لەخۆ کرد.﴾العنکبوت:٣٩-٤٠.

## پایەی جێنشینی سەر زەوی

زانیمان که خوای گەورە مرۆڤی له سەر زەوی کردۆته جێنشین و، هەرچی له ئاسمانەکان و زەویدایە، هەمووی بۆ بەردەست کردوون و، گوێڕایەڵیی فەرمانی بکەن و ئەوەی لێی قەدەغە کردوون، نەیکەن، چوونکه جێنشینیی لەسەر زەویی چەند مافێکی داوەته مرۆڤ و، چەند ئەرکێکی لەسەر پێویست کردووە، جا ئەگەر بمانەوێ مەڵبەندی جێنشینانی سەر زەویی دیاریی بکەین، پێویسته مەعنای زمانەوانیی ((کردن به جێنشین‌الاستخلاف)) بزانین و، مەعنا فیقهیەکەشی دەربێنین.

کردن به جێنشین له زماندا، دانانی جێگرێکه له شوێنی ڕۆیشتوویەك، یان بوونی کەسێکی دیکەیه به جێنشین له سەر شتێك، جا ئەگەر ئەم مەعنا زمانەوانی‌یەمان به سەر ئادەم و تۆرەمەکەی له لایەن خواوه به جێنشینی سەر زەویدا چەسپاند، دەبێ بڵێین: مرۆڤ یان جێنشینی خوایه، یان جێنشینی غەیری خوایه.

توێژەرەوانی قورئانیش هەر بەو ئامانجه گەیشتوون له لێکدانەوەی ئایەتی: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ: ئەو کاتەی

پەروەرندەی تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەوێ بریکارێك لەسەر زەمین دیاریی بکەم، گوتیان: تۆ کەسێکی وا دێنی لەوێدا خراپە بکا و خوێن بڕێژێ؟ کەچی ئێمە هەر شوکرانەی تۆ دەکەین و تۆ بە پاك ڕادەگرین! گوتی: ئەوەی من دەیزانم، ئێوە نایزانن.﴾البقرة: ٣٠.

جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان-وەکو پێشتر گوتمان- پێیان وایە مرۆڤ بۆتە جێنشینی دروست کراوێکی دیکە کە لەسەر زەویی ژیاوە و، دوایی فەساد و خوێنڕێژی تێدا ئەنجام داوە، هەندێکی دیکەش پێیان وایە مرۆڤ بۆتە جێنشینی خوای گەورە، نەك شتی دیکە.

بەڵام زۆریان پێیان گونجاو نییە بە مرۆڤ بگوترێ جێنشینی خوا، بەڵگەشیان ئەوەیە دەڵێن تەنها کەسێك جێنشینی دەبێ، کە وون بێت، یان بمرێت و، خواش نە وون دەبێت و نە دەشمرێ، هەروا بەڵگە بەوە دێننەوە کە جارێك بە ئەبوبەکریان گوت جێنشین(خلیفة)ی خوا، ئەویش گوتی: ((ئەمن خەلیفەی خوا نیم، بەڵکو خەلیفەی پێغەمبەری خوامﷺ)، بەڵام هەندێکیان پێیان وایە دەکرێ بە مرۆڤ بگوترێ جێنشینی خوا، مادام فەرمانەکانی خوا لە نێو دروستکراوەکانیدا ئەنجام بدات، چونکە خوای گەروە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ: هەر بۆ خۆشی ئێوەی کردە جێنشینانی سەرزەوی، هێندێکیان لە بەرانبەر هێندێك چەند پلە بردە سەرەوە، تا لەو شتانەی پێی داون تاقیتان بکاتەوە.﴾الأنعام: ١٦٥.. بێگومان بۆچوونی دوایی ڕاستترە، چونکە ناگونجی و نابێ ئەو زاتەی شتێك لە شێوەی نییە و شنەوا و بینایە، بە مرۆڤ پێوانە بکرێت، جا ئەگەر لە نێو مرۆڤدا وا باوبێت هەر لە کاتی ون بوون و مردندا جێنشینیان بوێ، ئەوە خوا دەکرێ جێنشینی هەبێت، هەرچەندە هەمیشە ئامادەیە و ون نابێ و زیندووە و قەت نامرێ، بۆ بەڵگەش ئەم ئایەتە بەسە:

﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾، هەروا ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ﴾ كە دەگونجێ بگوترێ مرۆڤ جێنشینی خوایە، بە تایبەتی كە خوا لە سەر ملكی خۆی كردوونی بە جێنشین و بۆی بەردەست كردوون: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ: هەرچی لە عاسمانەكان و زەمیندان، گشتی ئی ویـن﴾المائدة:١٢٠. ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە، خوا بۆ ئێوەی بەردەست كردووەو گشتی ئی ئەوە.﴾الجاثية:١٣.

جا مادام وایە، گرنگ نییە ئەوە ساغ بێتەوە داخوا مرۆڤ بۆتە جێنشینی دروستكراوێكی پێشتر، یان نا، چونكە ئەو دروست كراوەی پێشتریش، وەكو مرۆڤ خوا هەر كردویەتە بە جێنشینی خۆی، جا ئەگەر مرۆڤ بوو بێتە جێنشین جێنشینی خوا، بۆتە جێنشینی خواش، كەوا بوو بە هەموو بارێك دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە مرۆڤ بۆتە جێنشینی خوای مەزن، نەك ئی غەیری وی.

مەعنای فیقهی جێنشینیش، بریكاریی و جێگیریی و كار ڕاپەڕاندنە بە گوێرەی چەمكە فیقهیەكانی مرۆڤ، چونكە خوا بە ئایەتی ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً: من جێنشینێك لەسەر زەمین دادەنێم.﴾ مرۆڤی كردۆتە جێنشینی خۆی لە سەر زەویی، خوای بالاّ دەست بە ئایەتی : ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو-خوا- لە زەویی وەدیی هێناون و دنیای پێ ئاوەدان كردوونەتەوە.﴾هود:٦١. ئەركی مرۆڤی لەو جێنشینی یە دیاری كردووە، (استعمار) یش دەسەلاّت و دەست بەسەرداگرتن دەگەینێت و، ئەم دوو مەعنایەش هەردووكیان لەم ئایەتانە دا دیارن: ﴿وَلَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ: ئێمە ئێوەمان لەم هەردە جێكردەوە، هەر لەوێشدا بژێومان بۆ بڕینەتەوە، كەمتان شوكرانەبژێرن.﴾الاعراف:١٠.

﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوْا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ: ئەوانەی کە هەر کاتێکی دەستەلاتمان دانێ لەسەر زەویی، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و، فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و، سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بەدەست خوایە.﴾الحج:٤١.
﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆی بەردەست کردوون و، هەمووی ئی وی‌یە.﴾الجاثية:١٣.

مرۆڤیش کە دەسەلاتیان بەسەر گەردووندا هەیە و، سوود لەو دروستکراوانەی خوا بۆی بەردەست کردوون، وەردەگرن، لەسەریانە گوێڕایەڵی خوا بن و، لە سەر ڕێڕەوونی ی ئەو بڕۆن و، لەو شتانەی لێی قەدەغە کردوون، وەدوور کەون : ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ: ئەوسا ئەگەر لەلای منەوە ڕێنوێنێکتان بۆ هات، ئەوانەی بکەونە دوای رینوێنیم، نە لەهیچ شتێك دەترسن، نە خەم دەخۆن.﴾البقرة:٣٨. ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ(٦٠) وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ: ئاخر ئەی تۆرەمەی ئادەم، من لەپێشدا پەیمانم دەگەڵدا نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن، ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانە؟ هەر تەنیا خۆم بپەرستن، ڕێگای ڕاست هەر ئەمەیە!﴾یس:٦١-٦٢.

هەروا بێجگە لەوە، مرۆڤیش هەر یەکێکە لە دروستکراوەکانی خوا: ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ: خوا هەر ئەو خوایەیە کە ئێوەی دروست کردن و لەپاشان ڕۆزیی دانێ، دوای ئەوە دەتانمرێنێ و، دیسان زیندووتان دەکاتەوە.﴾الروم:٤٠. لە گەڵ دروستی کردوون و، کردوونی بە مرۆڤ و لە سەر زەویی بلاوی کردونەتەوە : ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ: وە لە نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە ئێوەی لە گڵ دروست کردو، لە پاشان بوونە مرۆڤ و بە زەویدا بلاوبوونەوە.﴾الروم:٢٠.

هەر بۆ ئەوەش دروستی کردوون تا بە تەواویی بیپەرستن : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: من هەر بۆیە جندۆکە و مرۆڤم دروست کرد، تا بمپەرستن.﴾الذاريات:٥٦. ناویشی لێ ناون بەندە و کۆیلەی خۆی و، هەر خۆشی بە سەریاندا زاڵە و، بە پێی کردەوەکانیان پاداشتیان وێ دەداتەوە، جا ئەوەی چاکە بکات بۆ خۆیەتی و ئەوەی خەراپەش بکات بۆ خۆی زەرەر دەکات: ﴿وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ: هەر خواشە لەسەر هەموو عەبدەکانی دەستی دەڕوات و، هەر بۆ خۆیەتی کارزانە و ئاگادارە.﴾الانعام:١٨. ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِلْعَبِيدِ: هەرکەسێك کاری چاك دەکا، بۆ خۆی دەکا و، هەرکەسێکیش خراپە دەکا، لەدژی خۆی کردوویەتی، پەروەردگارت غەدر لە عەبدانی ناکات.﴾فصلت:٤٦.

جێنشینی مرۆڤیش لە سەر زەویی، مەعنای ئەوەیە کە خوای گەورە لە سەر زەویی نیشتە جێی کردوون و، زەویی پێ ئاوەدان کردوونەتەوە و، ماڧ دەست بە سەر داگراتنی خێر و بێری نێو گەردوونی لە سنووری فەرمان و قەدەغە کردنی خوا داونەتێ، تا سودی لێ وەرگرن، جا ئەگەر خوا بەندەکانی لە سەر زەویی خۆی نیشتەجێ کردبن و، هەرچی لە گەردووندایە وەك خەڵات و بەخشش بۆی بەر دەست کردبن، ئەوە هەر شتێکی خوا کە لە دەستی ئەو بەندانە دایە، لە ڕووی فیقهی یەوە،سپاردەیەکە مرۆڤ سوودی لێ وەردەگرێت و، بە کارهێنانی سپاردەش لە شەرعدا بە بریکاریی دەبێت، جا با ئەو بریکارییە، بریکاری پەروەردگار بێت لە لایەن بەندەکەیەوە، یان ئی خاوەن بێت لە لایەن خاوەندار (مملوك)ەوە، کەواتە: هەموو مرۆڤێك بریکاری پەروەردگاری باڵا دەستێتی و، لەو شتەی کە لە گەردووندا بۆی بەردەست کردووە و، لە هەموو هەڵس و کەوتێکیدا، بە سنوورەکانی ئەو بریکارییەوە بەندە.

بەو جۆرە مەعنای جێنشینی لە ڕووی زمانەوانی‌یەوە، چی وای لە مەعنای جێنشینیی لە ڕووی فیقهی یەوە جیاواز نییە و، لە ئەنجامی ئەوەدا پایەی جێنشینەکانی سەر زەویی، دەبێتە پایەی جێگر، یان بریکار و، ((جێگریی یان بریکاریی))ش، بریکاری خوای گەورەیە و، دەکەوێتە نێو جوغزی ئەو دروستکراوانەی کە خوا بۆ مرۆڤی بەر دەست کردوون و، ئەو شتانەی خۆی، کە وای کردووە مرۆڤ دەسەڵاتی بە سەر دا هەبن و، هەموو ئەو شتانەی ڕێی بە کارهێنان و سوود لێ وەرگرتنی داون.

پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێت، بەر دەست کردنی گەردوون بۆ مرۆڤ و، دەسەڵات پێدانیان بەسەر مڵکی خوادا، ئەو شتانەی بەر دەست و لە بن دەسەڵاتی مرۆڤن لە بازنەی دەسەڵاتی خوایان، ناباتە دەرێ و هیچیش لەو دەسەڵاتە کەم ناکاتەوە، بۆ نموونە: مرۆڤ زەویی دەکێڵێ و، تۆی تێدا دەچێنی، بەڵام لە شین بوون و بەر گرتندا بە تەمای خوان و، بناوانی کێڵان و چاندنیشیان هەر بۆ خوا دەگەڕێتەوە، چونکە ئەو ژیان و عەقڵی پێ بەخشیون و، زانستی داونەتێ، کەواتە: مرۆڤ چاکە و نیعمەتی خوا بە کاردێنێت و، لەو بوارەدا، بێجگە لەو دەسەڵاتەی خوا پێی بەخشیون، هیچ دەسەڵاتێکی دیکەیان نییە.

## ئەرکەکانی جێ نشینانی سەر زەوی

مرۆڤ بۆ ئەوە نەکراوەتە جێنشین و ئاوەدانکەرەوەی زەویی تا بە کەیفی خۆیان چییان پێ خۆشە بیکەن و، بێ حیساب و چاودێریی چییان پێ ناخۆشە، نەیکەن، بەڵکوو خوا ئاوەدانکردنەوەی زەویی پێ سپاردوون و کردوونی بە جێنشین لە سەر زەویی تا تەنها خوای بێ هاوەڵ بپەرستن و،

گوێڕایەڵی فەرمانی بکەن و، چیی لیٚ قەدەغە کردوون نەیکەن، چوونکە ئەگەر جیٚنشین بوونیان لەسەر زەویی هەندیٚك ماف پیٚ دابن، ئەوە گەلیٚك ئەرکیشی خستوتە سەر شانیان.

هەڵبەت خوا، ئەو کاتەی مرۆڤی لە سەر زەویی نیشتە جیٚ ی کرد، بە گشتی لە سەری پێویست کرد بە دوای ڕێڕووینی یەکەی بکەویٚ و، شویٚن کەوتووی فەرمانی بێت: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ: ئەوسا ئەگەر لەلای منەوە ڕێنوێنیٚکتان بۆ هات، ئەوانەی بکەونە دوای ڕیٚنوێنیم، نە لەهیچ شتیٚك دەترسن، نە خەم دەخۆن.﴾البقرة:٣٨.

هەروا پەیمانیشی لیٚ وەرگرتوون کە شەیتان نەپەرستن و، خوا بپەرستن : ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لاَ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ(٦٠) وَأَنْ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ: ئاخر ئەی تۆرەمەی ئادەم، من لەپیٚشدا پەیمانم دەگەڵدا نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن، ئەو دوژمنیٚکی ئاشکراتانە؟ هەر تەنیا خۆم بپەرستن، تەنها ئەمە ڕیٚگای ڕاستە!﴾یس:٦١-٦٢.

هەریەك لەم دوو دەقەش، فەرمانیٚکی گشتی بۆ شویٚن کەوتنی ئەوەی خوا ناردویەتە خواریٚ و، حەرام کردنی غەیری وی.

خوای باڵادەستیش پەیمانی بەو کەسانە داوە بڕوایان بەوی هەیە و، لە سەر ڕێڕوویەکەی دەڕۆن، کە ترس و نیگەرانیان بۆ بکاتە ئاسایش و، لاوازییان بکاتە هیٚز و، بیانکاتە فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدار، هەروەکوو چۆن ئەوانەی پیٚش ئەوانی وا لیٚ کردوون و، دەستیان بدات و، لە سەر زەویی دەوڵەت و دەستەڵاتیان بەسەر خەڵك و دەوڵەتاندا بداتیٚ، بە مەرجیٚك فەرمانی خوا جیٚ بە جیٚ بکەن و، هەر ئەو بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنیٚن و، لە گوێڕایەڵیی ئەو لا نەدەن نە بە کەم نە بە زۆر: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى

لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا پەیمانی بەو کەسانەتان کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردون، داوە، کە بیانکاتە جێنشینی سەر زەویی، هەروەکو چۆن خەڵکی پێش ئەوانی کردە جێنشین، دینەکەشیان، کە خۆی پەسندی کردووە، هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و، ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنیا من بپەبرستن و هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن.﴾النور:٥٥.

خواش بۆ خۆی ئەرکەکانی جێنشینانی سەر زەویمان، لە کورتترین و پوختترین دەربڕیندا بۆ دەر دەخات و دەفەرموێ : ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ: ئەوانەی کە هەر کاتێکی دەستەڵاتمان دانێ لەسەر زەویی، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن و، فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێ لە خراپە دەگرن و، سەرەنجامی هەموو کارێکیش هەر بەدەست خوایە.﴾الحج:٤١.

جا یەکێك لە ئەرکەکانی جێنشینانی سەر زەویی، چ دەوڵەت بن چ تاك، ئەوە کە نوێژ بکەن و، تەنها ئەو کەسەش نوێژ دەکات کە دان بەوەدا دێنێ کە تەنها خوا پەرستراوی ڕاستە و محمد بەندە و ڕەوان کراوی وییە، ئەم دان پێدا هێنانە ئەرکی بێ ژمارەی لێ دەکەوێتەوە.

هەروا لە ئەرکەکانی جێ نشینانی سەر زەویی، زەکات دانە و، تەنها باوەڕ دارێکیش زەکات دەدات، کە پابەندی ئەرکەکانی سەر شانیەتی و، ئیعتیراف بەو مافانەی خەڵکی دەکات، کە لە سەر شانی ئەون.

فەرمان کردن بە چاکە و هەوڵی ڕێگرتن لە خەراپەش، لە ئەرکەکانی جێنشینانی سەر زەوییە و، کەسێکیش ئەو کارە دەکات، لە سەر فەرمانی خوا بەردەوام بێت و، دەست بە بەرنامەکەیەوە بگرێت و، لەسەر گوێڕایەڵی سوور بێت.

ئایه‌ته‌كه‌ هه‌ر ئه‌و سێ ئه‌ركه‌ی تێدان، چونكه‌ بوونی ئه‌و سێیانه‌، نیشانه‌ی بوونی ئه‌وانی دیكه‌شه‌، كه‌ ئیسلام فه‌رزی كردوون، چونكه‌ بوونی نوێژ كردن له‌ نێو نه‌ته‌وه‌دا، نیشانه‌ی ئیمان و گوێڕایه‌ڵیه‌ و، فه‌رمان كردن به‌ چاكه‌ و هه‌وڵی ڕێگرتن له‌ خه‌راپه‌ش، نیشانه‌ی ده‌ست پێوه‌ گرتنی فه‌رمانی خوا و بانگه‌وازی خه‌ڵكی بۆ لای و، گێڕانه‌وه‌یانه‌ له‌ لاڕێیی و یاخی بوون.

ئه‌وانه‌ی له‌ حوكمڕانیشدا ده‌بنه‌ جێنشین، ته‌نها مرۆڤی جێنشینی سه‌ر زه‌وین، جا ئه‌گه‌ر به‌ ناوی فه‌رمان ڕه‌وا له‌ سه‌ریان پێویست بێ كه‌ نوێژ بكه‌ن و، زه‌كات بده‌ن و، فه‌رمان به‌ چاكه‌ بكه‌ن و، هه‌وڵی ڕێگرتن له‌ خه‌راپه‌ بده‌ن، ئه‌وه‌ به‌ ناوی مرۆڤیش كه‌ جێنشینی سه‌ر زه‌وین، له‌ سه‌ریانه‌ گوێڕایه‌ڵی خوا بن و له‌ سه‌ر ڕێرووبینه‌كه‌ی برۆن و، توخونی قه‌ده‌غه‌ كراوه‌كانی نه‌كه‌ون.

پوخته‌ی ئه‌و قسانه‌ی پێشوو ئه‌وه‌یه‌ كه‌ جێنشینانی سه‌ر زه‌ویی، جا جێنشینیه‌كه‌یان چ گشتی بێ چ تایبه‌تی، گه‌لێك ئه‌ركیان له‌ سه‌ر شانن، كه‌ هه‌ر یه‌كه‌یان ده‌كه‌وێته‌ نێو جوغزێكی گه‌وره‌وه‌ كه‌ گوێڕایه‌ڵیی كردنی خوایه‌، واته‌ جێبه‌جێ كردنی فه‌رمانه‌كان و، دوور كه‌وتنه‌وه‌ له‌و شتانه‌ی قه‌ده‌غه‌ی كردوون.

## سزای به‌زاندنی سنووره‌كانی جێنشینی

له‌مه‌وپێش زانیمان كه‌ خوا مرۆڤی كردۆته‌ جێنشینی ی سه‌ر زه‌ویی و، دروست كراوه‌كانی خوی بۆ به‌رده‌ست كردوون و، له‌ سه‌ر ملكی خۆی كردوونیه‌ته‌ ده‌سه‌ڵاتدار و، به‌ كارهێنان و سوود لێ وه‌رگرتنی پێ سپاردوون و، پابه‌ندی كردوون و گوێڕایه‌ڵی بن و، له‌سه‌ر ڕێرونیه‌كه‌ی برۆن و ئه‌و شتانه‌ی لێی قه‌ده‌غه‌ كردوون و، نه‌یان كه‌ن و، گه‌یشتنه‌ ئه‌و ئه‌نجامه‌ی كه‌ پایه‌ی

جێنشینان لە سەر زەویی پایەی جێگر و بریکارە و، مرۆڤیش جێگر و بریکاری خوایە.

مەنتیقی فیترەتیش ئەوە دەخوازێ جێنشین یان جێگر، ئەگەر لە سنووری ئەو دەسەڵاتەی خوا پێی داوە، یان ئەو پێوەندانەی پێیانەوە بەستراوە، دەرچوو، ئەوە بێ گومان ئیشەکەی پوچە و، تەنها ئەوەندەی پەسەندە، کە دەکەوێتە نێو جوغزی جێنشینیی یان جێگریی.

ئەوەش کت و مت مەنتیقی ئیسلامی ئایینی فیترەتە، چونکە دەقەکانی قورئان ئەوەیان یەکلا کردۆتەوە و، کە هاوەڵ بۆ خوا دانان و، بوغزاندنی ئەوەی خوا ناردویەتە خوارێ و، باوەڕ نە هێنان بە نیشانەکانی و، کافر بوونی دوای ئیمان، ئەوانە هەموویان کردەوە هەڵدەوشێنێتەوە:

﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ: ئێمە، بە تۆو و بەوانەش کە بەر لەتۆ بوون، ڕامان گەیاند: ئەگەر لە پەرستندا هاوبەش بۆ خوا دانێی، کارەکەت هەڵدەوەشێ و پووچ دەبێتەوەو، لە زەرەرمەند و دۆڕاوان دەبی.﴾الزمر:٦٥.

﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ: ئەوە، چونکە ڕقیان لەو شتە بوو کە خوا ناردوویەتە خوار، جا خواش کارەکەی پووچ کردنەوە.﴾محمد:٩.

﴿وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَلِقَاءِ الآخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ: ئەوانەش باوەڕیان بە نیشانەکانی ئێمە و، دیداری ڕۆژی دوایی نەکرد، کارەکانیان هەڵدەوەشێنەوە.﴾الأعراف:١٤٧.

﴿وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ: هەرکەسێکتان لە دینی خۆی هەڵگەڕێتەوە، ئەوجار بە کافریی بمرێت، ئەوە ئەو جۆرە کەسانە کارەکانیان لە دنیا و قیامەتدا هەڵدەوەشێنەوە.﴾البقرة:٢١٧.

پوچ بوونەوەی کردەوەش، بە فیڕۆچوون و هەڵوەشانەوەیەتی بە شێوەیەك وەکوو هەر نەبوبێ، ئەوەش لە ڕێوشوێنی قانوونیماندا پێی دەڵێین: پووچ بوونەوەی ڕەها، واتە : ئەو پووچ بوونەوەی ڕاستکردنەوە هەڵناگرێت.

جا پووچ بوونەوە، هەر وەکوو چۆن لە هاوەڵ دانان بۆ خواو بوغزاندنی ئەوی ناردوویەتە خوارێ و، لە سەر بێ ئیمان و کافر بوونی دوای ئیمان پەیدا دەبێت، هەروا لە وەش پەیدا دەبێت کە موسڵمانان فەرمانی خوا و پێغەمبەر پشت گوێ بخەن، چونکە هەر کەسێك ئیمانی بە خوا و پێغەمبەر هەبێت، لە کارێکی بچووك یان گەورەدا، سەرپێچی لە فەرمانی خوا و پێغەمبەر بکات، یان لە هەر شتێکدا لە جوغزی گوێڕایەڵیی بچێتە دەرێ، ئەوە ئەو کارەی سەرپێچیی خواو پێغەمبەری پێ کردووە، یان پیێ لە جوغزی گوێڕایەڵیی چۆتە دەرێ، پوچە کە لە ڕاست کردنەوە نایەت هەروەکوو خوا دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَلاَ تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەر بکەن و، کارەکانی خۆتان پووچ مەکەنەوە.﴾محمد:٣٣.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيهِ اَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ: هەر کەسێك کارێك بکات لەوەی ئێمە هێناومانە بەدەربێت، ئەوە ئیشەکەی بە سەر خۆی دا دەدرێتەوە و، شوێنەواری نامێنی.﴾

جا لەو دەقانەی پێشەوە ڕا حاڵی دەبین کە هەر کارێك لە سنووری خوا بچێتە دەرێ، کارێکی پوچە بە تەواویی و لە ڕووی شەرعەوە شوێنەواری نییە، جا ئەو ئیشە چ لە موسڵمانانێکەوە سەری هەڵدابێ، چ لە کافرێکەوە و، چ لە کەسێکەوە سەری هەڵدابێ کە ئیمانی بە خوا هەیە، چ لە کەسێکەوە کە ئینکاری بوونی خوا دەکات و، هیچ موسڵمانێك بۆی نییە دان بەو کارە دابێنێ، یان پێی ڕاست بێت، یان ئەنجامی بدات، جا ئەو کارە لە هەر بابەتێك بێت،

حوکمڕانی بێت، بەڕێوبردن بێت، سیاسەت بێت، ئابوریی بێت، یان ڕۆشنبیریی، یان..... بێت.. هەروا ڕەفتارێکی شەرعی بێت، یان کارێکی مادیی بێت و، لە خانەی ئیسلام (دار الاسلام) دا کرابێت، یان لە خانەی کوفردا.

ئەوەیە حوکمی ئیسـلام کە خـوا کردوویەتە بەرنامەی ژیـانی مرۆڤ: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ: دین و بەرنامەی ژیـان لای خـوا هەر ئیسـلامە.﴾ال عمران:١٩. و، تێی گەیاندوون کە ڕازی نییە بێجگە لە ئیسلام بەرنامە و دینێکی دیکەیان هەبێت : ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ: هەرکەسێکی بێجگە لە ئیسلام دینێکی دیکەی هەبێت، لێی قبووڵ ناکرێت.﴾ال عمران:٨٥. داواشی لێ کردوون کە دەستی پێوە بگرن و لە سەری بمرن : ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە، بە تەواویی لەخوا بترسن و، بە مسوڵمانەتی نەبێ مەمرن.﴾ال عمران:١٠٢.

# سامان سامانی خوایە

- مرۆڤ لەم گەردونەدا خاوەن چی یە ؟
- سامان ئی خوایە و مرۆڤ مافی سوود لێ وەرگرتنی هەیە
- مرۆڤ تاچ رادەیەک بۆی هەیە سوود لە سامانی خوا وەرگرێت ؟
- راستیی، سامان ئی خوایە، چی لێ دەکەوێتەوە ؟
- مافی سوود وەرگرتنی مرۆڤ لە سامانی خوا چی لێ دەکەوێتەوە ؟
- مافی خەڵکی لە سامانی خوادا

# مرۆڤ لەم گەردوونەدا خاوەنی چی یە؟

لەمەوبەر زانیمان کە ئەم گەردوونە، ئەو خوایە دروستی کردووە و، بە هۆی ئەو عەقڵەی پێی داون، بە سەری دا زاڵی کردوون و، زەویی پێی ئاوەدان کردوونەتەوە، بەڵام بە گوێڕایەڵیی کردنی و ڕۆیشتن لە سەر ڕێڕوونیی خۆی، پابەندی کردوون.

گومانیشی تێدا نیە کە مرۆڤ لە دەسەڵات هەبوونیان بە سەر گەردووندا و، سوود وەرگرتن لەو هێزانەی تێیدان و، بەهرەمەند بوون لە خێر و بێرەکەی، لە پاراستنی ژیانیان و هێز و چالاکی یان، خۆراك و دەرمان و جلك و ڕایەخ و پەنایان دەوێ، هەروا پێویستیان بە ئامێر و دەزگاو ئاژەڵانە هەیە کە بە کارهێنانی گەردوون یەکی لە سەر دەکەون.

ئەو جار، بە کارهێنانی گەردوونیش وا لە سەر مرۆڤ پێویست دەکات، کە دەستەڵات بە سەر هەندێك زەویدا بگرن بۆ کشت و کاڵ و لەوەڕ، یان سوود لە دار و درەختەکەی وەرگرن، یان ئەو کانزا و نەوتەی تێیدایە دەری بێنن، یان خانوو و کۆگا و دووکان و کارخانە و گوند و شارەکانیان لە سەر بنیات بنێن.

هەروا کەنەفتیی مرۆڤ لە کاتی منداڵی و پیریی و نەخۆشیدا، ناچاریان دەکات بۆ بژێوی منداڵەکانیان و پیریی و نەخۆشیی خۆیان، پاشەکەوت بکەن. جا لەوانەیە ئارەزووی پاشەکەوت کردنی کەم، زیاد بکات و ببێتە ئارەزووی پاشەکەوتنی زۆر، ئەو پاشەکەوت کردنەش بەپێی کەسە کە، شێوەی جیا جیای وەکوو جێگیر (عقار) و گوازراوە و ئاژەڵ و کانزا وەردەگرێ.

جا با بزانین داخوا مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ئەو هەموو شتەی پێویستیەتی، یان بە سەریدا باز دەدات، یان پاشەکەوتی دەکات، سنووری خاوەنایەتیەکەی

چەندە؟ ئایا خاوەنایەتی‌یەکی تەواوە یان ناتەواوە؟ ئایا خاوەنایەتی‌یەکەی ڕەهایە یان نا؟

## سامان ئی خوایە و مرۆڤ مافی سوود لێ وەرگرتنی هەیە

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو دەقانەی هەمانن و، زانیارییەکانمان بە شێوەیەکی بەجێ ڕێك بخەین، دەگەینە ئەنجامێك، ئەویش ئەوەیە کە سامان هەمووی ئی خوایە و، مرۆڤ تەنها مافی سوود لێ وەرگرتنی هەیە.

چونکە خوای مەزن بۆ خۆی ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان و تێیاندایە دروستی کردووە: ﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ: ئەوە پەروەردگارتانە، بێجگە لەوی چ پەرستراوی دیکە نین، وەدیهێنی هەموو شتێکە﴾الانعام:١٠٢. ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا: هەر خۆیەتی، هەرچی لە زەویدایە، بۆ ئێوەی وەدیی هێناوە.﴾البقرة:٢٩. ﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ: خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەویی دروست کردووە.﴾ابراهیم:٣٢.

مەنتیقی ئێمەی مرۆڤیش وا دەخوازێ بەدیهێنی شت خاوەنی شت بێت، دەقەکانی قورئانیش پشتگیریی ئەو مەنتیقە دەکەن و، ئەوەیان یەکلا کردۆتەوە کە خوا خاوەنی ئاسمانەکان و زەویی و ئەو شتانەی لە نێوانیاندایە: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا: مڵکایەتی‌ی ئاسمانەکان و زەویی و هەرچی لەنێوانیاندایە، ئی خوایە.﴾المائدة:١٧. هەروا خوا خاوەنی هەموو شتێکی ئاسمانەکان و زەویی‌یە لە بچوك و گەورە، جا بە نرخ بێت یان بێ‌نرخ:

﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ: ملّکایەتی ئاسمانەکان و زەویی و هەرچی تێیاندایە، ئی خوایە.﴾المائدة:١٢٠. هەر ئەو زاتە پایە بەرزە بە تاقی تەنیا خاوەنی هەموو ئەو شتانەیە بێ ئەوەی مرۆڤ یان غەیری مرۆڤ هاوبەشی بێت: ﴿وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ: لە فەرمانڕەواییشدا شەریکی نەبووە﴾الفرقان:٢.

بەڵام خوای بەرز و گەورە، مرۆڤی کردۆتە مایەی ئاوەدانکردنەوەی زەویی : ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنْ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا: ئەو لەم خاکەی وەدیهێناون و، ویستی ئاوەدانی بکەن.﴾هود:٦١. و، لە سەر ئەو شتانەی باسمان کردن، کردوویەتە جێنشین : ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ فِي الأَرْضِ: خوا ئەو زاتەیە ئێوەی کردوونەتە جێنشینی سەرزەویی﴾فاطر:٣٩. و، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا دروستی کردووە، چەندە دەتوانن بە کاری بێنن و سوودی لێ وەرگرن، بۆی بەر دەست کردوون و، خستوویەتە بن دەستیان : ﴿أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً: ئاخۆ ئێوە نەتاندیوە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆ ئێوەی بەردەست کردوەو، بە ئاشکرا و بە نهێنی نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا ڕشتوون؟!﴾لقمان:٢٠.. ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، بۆی ڕام کردوون، هەمووی ئی خوایە.﴾الجاثية:١٣.

هەڵبەت خوا ملّك و سامانی خۆی هەر بۆ کەسێك یان کۆمەڵێك بەر دەست نەکردووە، بەڵکوو بۆ هەموو کەسی بەر دەست کردووە و، لە نێو هەموو بەندەکانی کە کردوونی بە جێنشینی سەر زەویی تا تێیدا بژین و سوودی لێ وەرگرن، بڵاوی کردۆتەوە، چونکە هەر کەسێك بژیەت و سوود لە شتێك وەرگرێت، ئەوە بە هۆی سامان و ملّکی خواوەیە و، لەو بارەوە کەس لە کەس

لە پێشتر نیە و، سوود وەرگرتن لە شتەکانی بوونەوەر، خوا بۆ هەمووانی داناوە و، لەمەدا هەموو کەس یەکسانە.

خوا بەندەکانی، کە کردوونی بە جێنشینی سەر زەویی، ڕوون کردۆتەوە کە ئەو شتانەی ئەو دروستی کردوون، بە کاریان دێنن و لە بەر و سوودیان بەهرەمەند دەبن و، هیچی دەستکردی خۆیان نییە، بەڵکوو بژێویکە خوا پێی داون و، چاکە یەکە لەگەڵی کردوون : ﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ؟ قل : الله: بڵێ: کێ لە ئاسمانەکان و زەویی‌یەوە بژێو بە ئێوە دەگەیەنێ؟ بڵێ: خوا.﴾سبأ:٢٤.

﴿هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ: ئایا وەدیهێنێکی دیکە بێجگە لەخوا هەیە، لە ئاسمانەکان و زەوییەوە بژێوتان پێ بگەیەنێت.﴾فاطر:٣.

جا ئەگەر هەر خوا ڕۆزیی دەربێت، پێویستە مرۆڤ داوای ڕۆزیی هەر لەوی بکات و داواکاری خۆی هەر بۆ لای ئەو بەرێت: ﴿فَابْتَغُوا عِنْدَ اللَّهِ الرِّزْقَ: داوای بژێو و ڕۆزیی لەخوا بکەن.﴾العنكبوت:١٧، چونکە هەر ئەو ڕۆزیی دەرەی بەهێزە و، دەتوانی ڕۆزیی دروست بکات و بیگەیەنێتە ڕۆزیی پێدراوان : ﴿اللَّهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِينُ: هەر خوا ڕۆزیی دەنێرێ و خودان هێزێکی پتەوە.﴾الذاريات:٥٨.

جا مڵك و سامانی خوا، بۆ سوودی مرۆڤ بەردەست کراوە و، هەموویان بۆیان هەیە سوودی لێ ببینن و، لێی بەهرەمەند بن و، ئیشی تێدا بکەن و، خواش لە بەروبووم و دەغڵ و دان و کرێ ی ئیشەکەیان ڕۆزیی یان دەداتێ و، ڕۆزیی یەکەش لە بن نایەت و، ئەوەش تەنها چاکەی مرۆڤ و کردووە و، هیچ سوودێکی بۆ خوا نییە و، خوا لەو شتە تەواو بە دوور و پاکە.

پێشتر گوتمان ئەو مڵك و سامان و بەرو بوومەی خوا کە لەبەر دەستی مرۆڤدایە، سپاردەیەکە مرۆڤ سوودی لێ وەردەگرێت و، سپاردە لا بوونیش لە

دابی مرۆڤدا، بریکاریی یه، جا با بریکاریی پەروەردگاریش بێت له لایەن بەندەیەوە، یان ئی کۆیله بێت له لایەن گەورەکەیەوە، هەروا زانیمان که پایەی جێنشینەکانی سەر زەویی، پایەی جێنشین یان جێگره و، جێنشینی یان جێگریش بۆ خوایه و، دەکەوێته نێو جوغزی ئەو دروستکراوانەی خوا بۆ مرۆڤی بەر دەست کردوون و، ئەوەی له سامانی خۆی خستوویەته بەر دەستیان و، ئەوەی له هەموو ئەو شتانەدا ڕێگای بە کارهێنان و سوود لێ وەرگرتنی پێداون.

جا ئەگەر خوای گەورە-که خاوەنی هەموو شتێکه-ئەوەی هەیەتی بۆ سوود لێ وەرگرتنی سەر پاکی مرۆڤ-که کردوویەته جێنشینی سەر زەویی بەردەستی کردبێت، ئەوه هەر خۆی ئەوەندەی حەز بکات لەو سامانه زۆرەی، دەداته هەر کەسێکی بیەوێت: ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ: خودا حەزبکا پاشایەتی بە هەرکەسێك بدات، دەیدات.﴾البقرة:٢٤٧.، جا ئەوەندەی که دەیداتێ، چ هێنده کەم بێت له خۆی زیاد نەبێت، یان ئەوەنده زۆر بێت، بەشی دەیان و سەدان کەس بکات : ﴿اللَّهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ: هەر خودایه، بە هەر کەسێك خۆی حەز بکات-چ زۆر، چ کەم- ڕۆزیی دەدات.﴾الرعد:٢٦. جا ئەو مرۆڤانەی شتەکەیان دەدرێتێ، هەر چۆنێك بن، ئەو حاڵەته ناگۆڕێت، چونکه هەموویان بەشێکن لەو کەسانەی کراونەته جێنشینی سەر زەویی و، سامانی خوایان لەبەر دەستدایه و، ئەو سامانەش تەنها ئەمانەته له لایان و، ئەوان لەو بارەوه تەنها ڕۆڵی بریکار و جێنشین دەبینن و، هەر ئەوەندەیان دەسەڵات بەسەر ئەو سامانەدا هەیه و، دەتوانن بە کاری بێنن و سوودی لێ وەرگرن، که خوا ڕێی پێداون.

هەروا خوا لەسەر مرۆڤی فەرز کردووه، لەو سامانەی خۆی که لەسەری کردۆته جێنشین و، هەڵسوڕاندنی پێسپاردووه، ببەخشێت: ﴿وَأَنْفِقُوا مِمَّا

جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ: لەو سامانەی ئێوەمان لەسەر كردۆتە جێنشین، ببەخشن.﴾الحديد:٧.

لە بەخشیندا سەرپشكیشی نەكردوون و، سەرسامییی دەردەبڕێ كە نەبەخشێ، چونكە هەرچی دەیبەخشێت ئی خوایە و خوا پێی داوە : ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُوا بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقَهُمُ اللَّهُ: ئەوانە چییان لێدەهات ئەگەر ئیمانیان بەخوا و ڕۆژی دوایی هێنابا و، لەوماڵەی خوا پێی داون، بەخشیبایان؟!﴾النساء:٣٩.

جا هەر جارێكیش خوا فەرمانی بە مرۆڤ كردبێت شت ببەخشێت، ئەوەی وەبیر هێناوەتەوە كە لەو ماڵەی ئەو پێی داون و، لەو ڕۆزیی ئەو بۆی ناردوون،دەبەخشن و، لەو بارەوە گەلێك دەقمان هەن، لەوانە : ﴿وَأَنفِقُوا مِنْ مَا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ: لەو ڕۆزییەی پێمان داون، ببەخشن، پێش ئەوەی بمرن.﴾المنافقون:١٠.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ يَوْمٌ لاَ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، لەو بژێوە كە پێمداون، بەخت بكەت، پێش ئەوەی ڕۆژەكە دابێ، ئەو ڕۆژەی نە سەوداكردن دەمێنێ و، نە تكا و، نە دۆستایەتی.﴾البقرة:٢٥٤.

﴿قُلْ لِعِبَادِي الَّذِينَ آمَنُوا يُقِيمُوا الصَّلاَةَ وَيُنفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلاَنِيَةً: تۆ بە عەبدە باوەڕدارەكانم بڵێ: نوێژ بكەن و، لەو بژێوەی بەشمان داون، بە نهێنی و ئاشكرا، ببەخشن.﴾ابراهيم:٣١.

﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ: ئەوانەی باوەڕیان بە نادیار(غیب) هەیە و، نوێژ دەكەن و، لەوەی پێمان بەخشیون، بەخت دەكەن.﴾البقرة:٣.

جا ئەگەر سامان ئی خوا بێت و، بە ئەمانەت لە لای ئەو کەسانە دانرابێت کە خوا پێی داون، ئەوە مرۆڤ بۆی نییە لە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا لە مەڕ ئەو سامانە خۆی بگنخێنێ،[1] ئەگەر فەرمانیان پێ کرا لەو سامانە بەشی چەند کەسێك بدەن، پێویستە لە سەریان دەستبەجێ بیدەن، چونکە لە سامانی خوایان دەدەنێ : ﴿وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ: لەوسامانەی خوا پێی داون، بیاندەنێ.﴾النور:٣٣.

جا هەر کەسێك سامانێکی لە بەر دەستدایە- هەموو سامانێکیش هەر ئی خوایە- لە سەریەتی فەرمانی خوای تێدا بە جێ بێنێ، جا سامانەکە بەردەستی کەم بێت، یان زۆر : ﴿وَمَنْ قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا: کێش بژێوی کەم پێگەیوە، با لەوەندەی خوا پێی داوە، بەخت بکات، خوا هەر ئەوەندە ئەرکە لەسەر مرۆڤ دادەنێ، کە پێی داوە.﴾الطلاق:٧.

نابێ کەسیش وا بزانێ ئەو سامانەی خوا کە لەبەر دەستیدایە، رۆزییەکە خوا هەر داویەتە وی و، بۆی نییە خەڵکی لێ بێ بەش کات و، ڕژدیی و سەقیلیی لەگەڵ خەڵکی موستەهەق بنوێنێ، چونکە خوا بۆیە رۆزیی دەداتە خەڵکی و لە سامانی خۆی دەیانداتێ، تا لە جوغزی فەرمانی خوادا ڕەفتاری لەگەڵ بکەن و، کاتێك خوا رۆزیی هەندێك کەسی لە هەندێکی دیکە زیاتر داوە، نابێ خاوەنی رۆزیی زۆرەکە پێی وا بێ ئەگەر لێی ببەخشێ و بیدات خەڵکی دی، ئەوە لە رزقی خۆی بەخشیوە و داوە، دەبێ بزانێ لە سامانی خوای بەخشیوە و، هیچ شتێکی خۆی نابەخشێت، بەڵکوو ئەو تەنها نێوەندێکە لە سامانی خوای داوەتە خەڵکی، هەر وەکوو چۆن هەر لەو سامانەی بۆ خۆشی هەڵگرتووە : ﴿وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ

---

[1] گنخ: دواخستن، نەجولآن، تەمبەڵی کردن، خاوەخاوکردن.

عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ: خودا ڕۆزیی هێندێکتانی لە هێندێکان پتر داوە، ئەوی پتریان پێدراوە، بەشی ژێردەستانی خۆیان نادەنەوە، کە لەوەشدا وەکو یەکن، ئایا ئەوانە حاشا لە بەهرەی خوا دەکەن؟!﴾النحل: ٧١.

نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێت کە هەندێك دەقی قورئان، سامانیان داوەتە پاڵ مرۆڤ، وەکوو خوا دەفەرموێ : ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ: لەخواردنی ماڵی یەکتر بە ناڕەوا، دوورکەونەوە.﴾البقرة:١٨٨.

هەروا: ﴿وَآتُوا الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ: هەتیوان، ماڵی خۆیان وێ دەنەوە﴾النساء:٢. و، ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ: ئێوە لە گیانتان و لە داراییتان، وەبەر تاقیکاریی دەکەون.﴾ال عمران:١٨٦، و، ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً: لەداراییەکی هەیانە، سەدەقەیان لێ وەرگرە.﴾التوبة:١٠٣، و ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ: بێگومانم خوا سەر و ماڵی لە بڕواداران کڕیوە، کە بەهەشتیان بداتێ.﴾التوبة : ١١١. و، ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ: لە ماڵ و سامانیشیاندا بەشێك بۆ سواڵکەر و بێبەشان هەیە.﴾الذاريات:١٨.

جا لێرەدا کە سامان دراوەتە پاڵ مرۆڤ-لە هەندێك دەقی دیکەشدا- مانای ئەوە نییە مرۆڤ بۆتە خاوەنی سامان، بەڵکوو ئەوە دەگەیێنێ مرۆڤ بۆتە خاوەنی مافی سوود لێ وەرگرتنی، چونکە-هەر وەکوو لە پێشدا گوتمان- سامان سامانی خوایە و، هەر ئەو زاتە خاوەنی هەموو شتێکە و، هەر بۆیە بۆ مرۆڤ بەردەستی کردووە تا لێی بەهرەمەند بن، ئەگەر درایە پاڵیشیان، تەنها مەبەست ئەوەیە مافی سوود لێ وەرگرتنی هەیە، واش باوە کە بچوکترین هۆ(سبب) بۆ درانە پاڵ بەسە، ئەوەتا قورئان سامانی بێ عەقڵانی داوەتە پاڵ سەرپەرشتیارەکانیان، نەك لە بەر ئەوەی خاوەن ماڵەکەن، بەڵکوو لەبەر ئەوەی بە هۆی مافی سەرپەرشتیارییەوە مافی دەست تێوەردانی سامانەکەیان هەیە، جا

خوا دەفەرموێ : ﴿وَلاَ تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفًا: ماڵی خۆتان، کە خوا کردوویەتە مایەی گوزەرانتان، مەدەنە دەست خەڵکی بێ عەقڵ، بەڵام جلك و بژێویان لەماڵی خۆتان بۆ دابین کەن و، بەڕووی خۆشەوە بیاندوێنن.﴾النساء :٥. لێرەدا سامانی خوا بۆیە دراوەتە پاڵ مرۆڤ چونکە بە هۆی هەبوونی ماڤ سوود لێ وەرگرتنی وەکوو ئەوەیە کە سامانی بێ عەقڵانی دەدرێتە پاڵ سەرپەرشتیارانیان، لەبەر ئەوەی مافی دەست تێوەردانی ئەو سامانەیان هەیە.

کەواتە : ناکرێ دەقەکان، ئەگەر دەقی تری پێچەوانەیان هەبن بە گوێرەی ڕوخساریان لێك بدرێنەوە قاعیدەش وایە دەقەکانی قورئان بە تەنیا و جیا جیا وازیان لێ ناهێنرێت، بەڵکوو بە خڕ یی وەردەگیرێن و بە خڕیش تەفسیر دەکرێن، ئەو تەفسیرە ڕاستەش کە نەسازیی(تناقض) لا دەبات، بە شێوەیەکی مەجازیی، سامان دەداتە پاڵ مرۆڤ و، هەر بۆیە داویەە پاڵی، چونکە لە بەردەستیاندایە و، لەو جوغزەدا کە خوا دیاریی کردووە، مافی ئەوەیان هەیە سوودی لێ وەربگرن.

پوختەی ئەو قسانە ئەوەیە کە ئەو سامانەی لە دەستی مرۆڤدایە، بە هەموو شێوە و جۆر و بڕە جۆرا و جۆرەکانیەوە و، هەر سامانێکی دیکەش کە لێی دەکەوێتەوە، هەمووی هەر سامانی خوایە، نەك ئی وان و، ملکی خوایە نەك ئی وان، کە خوا لە سەری کردوونە جێنشین و خستویەتە بەردەستیان و، لەو سامانە تەنها مافی سوود لێوەرگرتن و ئەو شتانەیان هەیە لەو مافە دەکەونەوە، وەکوو بە کارهێنان و دەست تێوەردان.

# مرۆڤ تاچ ڕادەیەک بۆی هەیە سوود لە سامانی خوا وەرگرێت؟

مرۆڤ بۆی هەیە سوود لەو سامانەی خوا، کە لەبەر دەستیدایە، وەرگرێت، ئەوەش تاکە مافە کە بەسەر ئەو سامانەوە هەیەتی، سوود وەرگرتن لە سامانیش، ڕەنگە بە بەکارهێنان و وەبەرهێنانی بێت، وەکو لە زەویی کشتوکاڵ و کانگەی کانزا و کانەبەرد و، لەوانەشە بە سەرف کردنی سامان بێت، وەکو لە خواردن و خواردنەوە و بەروبوومدا، یان دەست تێوەردانی سامان بە شێوەیەکی ڕەوا، وەکو فرۆشتن و وەسیەت و بەخشین.

جا مرۆڤ بۆی هەیە لە هەموو ئەو بوارانەدا سوود لە سامان وەرگرێت و، ناکرێ بە هۆی مافی سوود لێ وەرگرتنی سامانەوە، لە مافی بەکارهێنان و سەرف کردنی هەندێکی بێ بەش بکرێن، چونکە مافی سوود لێ وەرگرتنیان هەیە، جا ئەگەر سوود لێ وەرگرتنەکە بە بەکارهێنان نەبێ، نەکرێت، ئەوە بەکارهێنانەکە بۆ خۆی سوود لێ وەرگرتنە..

هەڵبەت خوای گەورەش ڕێی بە مرۆڤ داوە ئەوەندە لە سامانەکەی بەکار بێنێ کە مایەی سوود لێ وەرگرتنە، ئەوەتا ڕێی داوە خواردن و خواردنەوە و بەروبووم و جلك و نێو ماڵ بەکاربێنێ، هەروا ڕێی داوە هەموو شتێکی چاك و بەکەڵك و، هەرشتێك بارودۆخی ژیانی پێداویستی بەکارهێنانی بێت، بەکار بێنێ، دەقەکانیش لەو بارەوە ڕاشکاو(صریح)ن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿كُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالاً طَيِّبًا﴾المائدة:٨٨، ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا مِنْ رِزْقِ اللَّهِ: **بخۆن و بخۆنەوە لە بژێوی خوا**﴾البقرة:٦٠.

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ: **ئەی ئەوانەی باوەڕیتان هێناوە، لەو ڕۆزییەی چاکەی پێمان بەخشیون، بخۆن**﴾البقرة:١٧٢، ﴿كُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ: **لە بەرەکەی بخۆن ئەگەر بەری دا..**﴾الانعام:١٤١، و ﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ(٨٠)وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالاً وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ: **خودا خانووی بۆ دروست کردوون تێیاندا بحەسێنەوە، ئەنواشی لە پێستی وڵسات بۆ سازداون کە لە ڕۆژی کۆچ کردن و لەکاتی مانەوەشتاندا، بۆتان سووك بێت، لە خوریە و بەرگن و موویان، کەل و پەلی پێویستی ماڵ و کاڵا هەیە لە ماوەی گوزەرانتاندا. خوا لەوەی وەدیهێناوە، سێبەری بەهرەگەلی خۆی بۆ ئێوە تەواو دەکات، بەڵکو گوێ بە فەرمانی بن.**﴾النحل:٨٠-٨١، و ﴿وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ: **هەرچی لێتان خواستوە، پێی ڕەوا دیون.**﴾ابراهیم:٣٤، و ﴿قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ: **بێژە: کێیە جلکی جوان و خشڵ و بژێوی پاکژی، کە خوا بە عەبدەکانی خۆی ڕەوا دیوە، لای وایە کە ناڕەوایە؟!**﴾الاعراف:٣٢.

**مافی سوود وەرگرتن لە سامانیش لە لایەن مرۆڤەوە، مافێکی ڕەها نییە، بەڵکو بە چەند شتێکەوە بەندە، بۆیان نییە بە کەیفی خۆیان سوود لەو سامانە وەرگرن، بەڵکو بۆیان هەیە تەنها بە گوێرەی پێویستی خۆیان سوودی لێ وەرگرن و، ئەوەندەی پێویستیی و نیازمەندییان ناهێڵێ، بە کاری بێنن، بە مەرجێك ئەوە هەمووی لە سنووری میانڕەویدا بێت و، نەکەوێتە نێو جوغزی**

دەستبڵاویی و سەقیلیی و، بۆیان نییە لە خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگ و کاروباری ژیانیاندا، زیادەڕۆیی بکەن و، بۆیان نییە سەقیلیی (ڕژدیی) لەگەڵ خۆیان بکەن و، دەبێ لەو نێوانەدا میانڕەوبن و ئەو سنوورە نەبەزێنن، چونکە خوا دەستبڵاویی و دەست کردنەوەی بێ سنووری لەمەڕ ماڵ و سامان لێ حەرام کردوون، هەروەکو چۆن سەقیلیی و دەست قووچاندن لەگەڵ خۆی لەمەڕ ئەو شتەی پێویستی پێیەتی، حەرامی کردووە : ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلاَ تُسْرِفُوا: بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەکەن﴾الاعراف:٣١، ﴿كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَلاَ تَطْغَوْا فِيهِ: لەو ڕۆزییە چاکانەی پێمان بەخشیون، بخۆن و، تێی مەپەڕێنن﴾طه:٨١، ﴿وَالَّذِينَ إِذَا أَنفَقُوا لَمْ يُسْرِفُوا وَلَمْ يَقْتُرُوا وَكَانَ بَيْنَ ذَلِكَ قَوَامًا: (بەندە چاکەکانی خوا) ئەوانەشن کە لەکاتی ماڵ بەخشیندا، نە دەستبڵاویی دەکەن و نە دەست قووچاویی و، لەو نێوانەدا دەمێننەوە.﴾الفرقان:٦٧، ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ: دەستەکانت دە گەردەنت وەرمەهێنە و، تەواویش ئاوەڵەیان مەکەوە.﴾الاسراء:٢٩.

جا ئەگەر تاك بۆی هەبێ بەقەدەر پێویستیی لە سامانی خوا هەڵگرێ، بۆشی هەیە بەقەدەر پێویستیی ئەو کەس و کارەشی کە دەبێ بیانژیەنێ، وەکو ژن و منداڵ و دایك و باوك، هەڵگرێت، هەروا بۆی هەیە هەندێك لە سامانی خوا هەڵگرێت تا بۆ پاراستنی سامانەکەی دیکە و خستنەکارو وەبەر هێنانی، بەکاری بێنێ، دەبێ هەموو ئەو کارەش لە نێو جوغزی میانڕەویی و، بێ دەستبڵاویی و سەقیلیی ئەنجام بدات.

# ڕاستیی «سامان ئی خوایه» چی لێ دەکەوێتەوە؟

ڕاستیی ((سامان ئی خوایه))، ئەم ئەنجامانەی خوارەوەی لێ دەکەوێتەوە :

١/ هیچ کەس– جا هەر کێ بێت– بۆی نییه به یەکجاریی ببێته خاوەنی سامان و، کەس بۆی نیه بێجگه له سوود لێ وەرگرتن، مافێکی دیکەی بەسەر سامانەوە هەبێت، چونکه:

مافەکانی خوای گەورە لەباوەڕەوە نەگۆڕن و، هیچ مرۆڤێك–فەرمان ڕەوا بێت یان مسکێن، تاك بێت یان کۆمەڵ–بۆی نییه نه دەستیان تێ وەردات، نه چاو پۆشیان لێ بکات.

٢/ کۆمەڵ بۆی هەیه بەهۆی کاربەدەستان وئەهلی ڕاوێژەوە، کەنوێنەری ئەون، چۆنیەتی سوود وەرگرتن لەسامان ڕێك بخات، چونکه سامان هەرچەنده ئی خوایه، بەڵام بۆ سوودی کۆمەڵی داناوە، لەئیسلام دا وا باوە که هەر مافێك ئی خوا بێت، ئەوە بۆ سوودی کۆمەڵەو، کۆمەڵ نەك تاکەکان، بەسەری ڕادەگەن.

٣/ ئەگەر بەرژەوەندی گشتی بخوازێت، کۆمەڵ بۆی هەیه بەهۆی نوێنەرەکانیەوە لەکاربەدەستان وئەهلی ڕاوێژ، سامان لەکەسێ بستێنێ بەمەرجێك بەشێوەیەکی لەبار سامانەکەی بۆ بژێرێ، چونکه ئیسلام ڕێ به داگیرکردن نادات و، نابێ سامان لەکەس بسێنرێت، بەخۆشی خۆی نەبێت، هەروەهاش لێ ستاندنی ناڕەواش دروست نیه، وەکو خوای گەورە دەفرموێت﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ: له خواردنی ماڵی یەکتر بەناڕەوا

دورکەونەوە.﴾البقرة :١٨٨ و، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : ((كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَعِرْضُهُ وَمَالُهُ: هەموو شتێکی مسوڵمان لە مسوڵمان حەرامە، سەر و نامووس و ماڵی.))، دەشفەرموێ: ((إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ: بێگومان سەر و ماڵتان لێك حەرامە)).

٤/ ئیسلام هەرچەندە ڕێی خاوەنایەتی بێ سنووری داناوە، بەلاّم ڕێشی داوە کۆمەڵ-کە مافەکانی خوا دەپارێزێ وچۆنیەتی سوود لێ وەرگرتنیان ڕێك دەخات بەهۆی نوێنەرەکانیەوەئەگەر بەرژەوەندی گشتی بخوازێت خاوەنایەتی کەسێك بەسەر سامانێکی تایبەتییەوە کەم کاتەوە، وەکو کەم کردنەوە خاوەنایەتی زەوی کشتوکاڵ بەئەندازەیەکی دیاری کراو، یان خاوەنایەتی زەوی بیناسازی.

## مافی سوود وەرگرتنی مرۆڤ لەسامانی خوا چی لێ دەکەوێتەوە؟

مافی سوود وەرگرتن لەسامانی خوا و،هەبوونی ئەم مافەش، ئەم ئەنجامانەی لێ دەکەوێتەوە :

١/ هەرچەندە کۆمەڵ پارێزەری مافی خوایە، کە خاوەنیەتی سامانە، بەلاّم بۆی نیە دەست لەخاوەنایەتی تایبەتی سوود لێ وەرگرتنی خەڵك وەردات، مەگەر لە رووی ڕێکخستنی مافی سوود لێ وەرگرتن و، بۆی نیە خاوەنایەتی سوود لێ وەرگرتن- کەخوا بۆ خەڵکی داناوە- حەرام کات.

٢/ بێ گوومان خاوەنایەتی سوود لێ وەرگرتن، هەروەکو چۆن بەکەسێکەوە بەندە، بەگواستنەوەی ئاڵوگۆڕیشەوە بەندە، خاوەنی مافی سوود لێ وەرگرتن،

دەتوانیْ بەفرۆشتنی بارمتەو وەسیەت و لەدەست تیْوەردانی دیکەی ڕەوا، بیداتە خەڵکی دیکە، هەروا لەدوای مردنی خاوەنەکەی، دەبیْتە ئی پاشماوەکانی کە میراتی دەگرن.

٣/ خاوەنایەتی سوود لیْ وەرگرتن، لەبنەڕتدا بۆ تاکەکان هەمیشەییە، واتە : بۆ ماوەیەکی دیاری کراوە وە بەند نیە، دروستە شتیْك لەبەردەسی کەسیْ دابیْت و، سوودی لیْ وەربگریْت تا دەمریْت و ئنجا مندالْ و نەوەکانی بەمیرات بیگرن تامردن، وەکو لەمەسەلەی وەقف دا.

٤/ بیْ گومان خاوەنایەتی سوود لیْ وەرگرتن، بۆ ئەوەیە تاك بەشیْوەیەکی ڕاستەوخۆ سوودی لیْ وەر بگریْت و، کۆمەڵیش بەشیْوەیەکی ناڕاستەوخۆ سوودی لیْ وەربگریْت، جا ئەگەر بابای سوود وەرگر سامانەکەی ڕاگرت و سوودی لیْ وەرنەگرت، ئەوە کۆمەڵیش سوودی لیْ وەرناگریْت، لیْرەدا کۆمەڵ بۆی هەیە لیْی بستیْنیْ، بەمەرجیْ بەگویْرەی نرخەکەی بۆی ببژیْریْت

## مافی خەڵکی لە سامانی خوادا

جا ئەگەر هەموو کەس لەو سنورانەدا کەباسمان کردن، مافی سوود وەرگرتنی لەسامانی خوا هەبیْت، ئەوە خەڵکی دیش چەند مافیْکیان هەن، کەخوا لەو ماڵە فەرزی کردوون، لەسەر ئەو کەسانەی سامانەکەیان لەدەستدایە، پیْویستی کردوە وەکو جیْ نشینی سەر ماڵی خوا ڕەفتار بکەن، ئەو مافانەش ئەمانەن :

### ١/ زەکات :

ئەویش فەڕزیْکە لەسامانی خوا دا و، هەرکەسیْکی بەشیْی لەسامانی خوای لەدەست دابیْت، لەسەری پیْویستە لەو سامانەی دەرکات، هەرکاتیْك گەیشتە

برێکی دیاری کراو، دەیداتە دەوڵەت تا بەگوێرەی دەقەکانی قورئان بیداتە ئەو کەسانەی پێویستیان پێ یەتی.

زەکاتیش لەپایەکانی ئیسلامە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ((بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَصَوْمِ رَمَضَانَ وَحَجِّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيهِ سَبِيلاً: ئیسلام لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە: شایەتی دان کە بێجگە لەخوا چ پەرستراوێکی دیکە نین و، موحەممەد بەندە و نێرراوی خوایە و، نوێژکردن و زەکات دان و، ڕۆژووی ڕەمەزان و حەجی ماڵی خوا بۆ کەسێك کە بۆی مەیسەر بێت.)).

زۆربەی دەقەکانیش، وێکڕا باسی نوێژو زەکات دەکەن، وەکو خوا دەفەرموێ ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ: نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن﴾البقرة:٨٣ هەروا دەفەرموێ ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ: جا ئەگەر تۆبەیان کرد و، زەکاتیان دا، ڕێیان بەردەن.﴾التوبة:٥، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ :((أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ: فەرمانم پێکراوە شەڕ لەگەڵ خەڵك بکەم تا ئەو کاتەی شایەتی دەدەن کە بێجگە لەخوا چ پەرستراوی دیکە نین و، موحەممەد ڕاسپێرراوی خوایە و، نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن، جا ئەگەر وایان کرد، ئەوە سەر و ماڵی خۆیان لەمن پارازتووە و حیسابیشیان عایدی خوایە.)).

زەکات لە سامان دا فەڕزە، لەبەر ئەوە لەسەر پیاو وئافرەت و گەورەو بچوك پێویستە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا: لە دارایی‌یەکی هەیانە، سەدەقەیان لێ وەرگرە، تا بەوە پاك و خاوێنیان کەیەوە﴾التوبة:١٠٣. بڕەکەشی بەپێی جیاوازی سامانەکە دەگۆڕێت، جاری وا هەیە دەگاتە دە یەکی سامانەکە، وەکو لەدەغڵ ودانەدا، جاری واشە

دەگاتە (٢/٥)ی سامانەکە وەکو لە خشڵ (زێڕ وزیو)وە پارەدا، هەندێك جاریش لەوە کەمتر، وەکو لەزەکاتی ئاژەڵدا. هەر سامانێکیش ساڵی بەسەر دا بسوڕێتەوە، زەکاتی لێ دەکەوێ، وەتە ساڵێکی تەواو لەبەر دەستی ئەو کەسە دا بێت کە لەسەری جێ نشینە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمێ : ((لا زَكَاةَ عَلَى الْمَالِ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ: هیچ سامانێك، تا ساڵی بەسەردا نەسوڕێتەوە، زەکاتی لێ ناکەوێ.)).

٢/ بەخشین :

سامان بەخشینیش لە ئیسلامدا، بە خەسڵەتێك لەو خەسڵەتانە دادەنرێت کە بە نیشانەی ئیسلامەتی و ئیمانداری گوێڕایەڵی خواو، ئەنجامدانی فەرمانەکانی لەقەڵەم دەدرێت و،کاتێك خوا باسی پارێزگاران دەکات، دەفەرموێ ﴿الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ: ئەوانەی کە نوێژ دەکەن و لەوەی پێمان داون، دەبەخشن﴾البقرة:٣. و، باوەڕ کردن بە نادیار(غیب) ونوێژ کردن و سامان بەخشینی، وەکو یەك حیساب کردوون و، هەمووی بەنیشانەی تەقوا داناون.

خواش وا باسی باوەڕداران دەکات کە ئەو کەسانەن لەخوا دەترسن و، ئەگەر ناوی برا دڵیان ڕادەچڵەکێت و،ئایەتەکانی خوا یان بۆ بخوێنرێتەوە، باوەڕیان زیاد دەکات و، ئیش دەکەن و ئەوەندەی لەدەستیان دێ، بەچاکی ئیشەکەیان دەکەن و، دوای ئەوە پشت بەپەروەردگاریان دەبەستن و، ئەو کەسانەن کە نوێژ دەکەن وە لەو سامانەی خوا پێی داون، دەیبەخشنەوە.

خوا جەختی بۆ کردووین کە ئەو خەسڵەتانە، خەسڵەتی باوەڕداری ڕاستەقینەن، کەواتە : بەخشین خەسڵەتێکە لە خەسڵەتەکانی باوەڕدار و، نیشانەی باوەڕی ڕاستەقینەیە ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ(٢)الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا

رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ(٣)أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا: بڕواداران هەر ئەوانەن کە هەر کاتێك ناوی خوا هێنرا، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، ئەگەر ئایەتەکانی خوێنرانەوە، ئیمانیان زیاد دەکا و، پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن. ئەوانەن کە نوێژ دەکەن و لەوەی پێمان داون، دەبەخشن، ئەوانە بڕواداری ڕاستن.﴾الانفال:٢-٤.

بەڵکو بەخشین لەئیسلامدا، بەبنەڕەتێك لەبنەڕەتەکانی خێرو چاکە دادەنرێت چاکە بەبێ بەخشین تەواو نابێت، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ: کاری چاك ئەوە نیە ڕوو دە ڕۆژهەڵاتێ، یان ڕۆژئاوا بکەن، چاکە ئەوەیە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێب و پێغەمبەرانی خوا هەبێ و، لەو سامانەی کە زۆریشتان خۆشدەوێ، بەشێك بدەن بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و سواڵکەران و، کۆیلانی پێ بکڕنەوە و، نوێژ بکەن و زەکات بدەن و، هەرکاتێکیش پەیمانێك دەبەستن، نەیشکێنن و، لە نەداریی و گرفتاریی وە تەنگانەدا خۆڕاگر بن، ئەوانەن کە ڕاست دەکەن و، هەر ئەوانەشن پارێزکارانی لەخواترس.﴾البقرة:١٧٧.

**لەدەقی ئایەتەکانەوە ئەم شتانەمان بۆ دەردەکەون :**

یەکەم : باوەڕهێنان بەخوا وبەفریشتەکانی وبەکتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی وڕۆژی دوایی، بەبنەڕەتێك لەبنەڕەتەکانی خێروچاکە داناوەو، ئەو کردەوە چاکانەش کە لەباوەڕ دەکەونەوە وئەنجامی ئەوەن، بەدووەم بنەڕەتی خێر و چاکەی داناوە-جا خێر و چاکە ئەوەیە کە ئیسلام ئامانجیەتی و، ئەو بنەڕەتانەی لە سەریشیان بنیات دەنرێن، باوەڕی یەتی و ئەنجام دانی ئەو

کارانەیە، ئەو باوەڕە دەخوازێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: با لەئێوە کۆمەڵێك پێك بێت بانگەواز بکەن بۆ کاری چاك و، فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێ لە خراپە بگرن و، هەر ئەوانەن سەرکەوتوو.﴾آل عمران:١٠٤

جا ئامانج بانگەوازکردنە بۆ چاکە و، دەستەواژەی (وسیلة)ش فەرمان کردن بە چاکە و ڕێ گرتن لە خراپەیە، هەموو ئیسلامیش دەکەوێتە ناو جوغزی ئەو دوو کارەوە، وەکوو خوا دەفەرموێ : ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ: بۆ هەر کۆمەڵێك لە ئێوە، ڕێ و شوێنێکمان داناوە، ئەگەر خوا مەیلی لێبا، هەمووی دەکردنە یەك نەتەوە، بەڵام ویستی خوا وابوو لەو شتانەی کە پێی داون بە تاقیتان بکاتەوە، دەسا ئێوەش لەکاری چاك پێشبڕکێ لەگەڵ یەکدی بکەن، هەمووتان دەگەڕێنەوە لای خوا و، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکا لەسەرچی کێشەو لە نێودا پەیدا بووبوو.﴾المائدة:٤٨ چونکە ئامانجی ئاینەکان تەنها چاکەیە و، ئاینەکان خەڵك تەنها بۆ دەست پێشخەری لە کاری چاك بانگ دەکەن و، دەستەواژەیان بۆ ئەو کارە، باوەڕ بە خوا و ئیش کردنە بە گوێرەی فەرمانی خوا.

دووەم: بەخشینی لەسەر ڕووی ئەو کارە چاکانە داناوە خێر و چاکە وەدیدێنن و، مەبەست لە ئامانجی ئیسلامن، هەروا دەقەکە بەخشینی خستۆتە پشت نوێژ و زەکاتەوە، ئەویش بەڵگەیەکی تەواوە بۆ گەورەیی بەخشین لە ئیسلامدا و، نیشانەی ئەوەشە ئەو موسوڵمانەی نەبەخشێت، ئیسلامەتیەکەی تەواو نیە.

هەڵبەت خوای گەورەش بۆی ڕوون کردووینـەوە، کە تا لەو سامانەی کە لامان هەرە خۆشـەویســت و بەڕێزە، نەبەخشین، ناگەینە ئەو ئامانجەی ئیســلام هەوڵی بەدیهێنانی دەدات، کە خێر و چاکەیە، ئەوەتا دەفەرموێ :

﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ: تا لەو شتەی کە ئێوە خۆشتان گەرەکە، نەبەخشن لەڕێی خوادا، هەرگیز هیچ خێرو پێناگات.﴾آل عمران:٩٢ و، هەرکەسێکیش لەو شتەی خۆشی دەوێ، ببەخشێت، شتی دیکەی پێ ئاسانە.

لەوەی ڕابرد بۆمان دەردەکەوێت کە ئامانجی ئیسلام چاکەیە و، دەستەواژەکانیشی بۆ چاکە، باوەڕ و کردەوەی چاکە و، نەبەخشین دەبێتە هۆی نەگەیشتن بە ئامانجی ئیسلام، کە چاکەیە، جا ئەگەر بەخشین دەستەواژەیەک بێت لە دەستەواژەکانی ئیسلام بۆ چاکە و، ئەنجامێک بێت لە ئەنجامەکانی باوەڕ بە خوا، ئەوە ئەو مسوڵمانەی نابەخشێت، شاهیدیی سەرپێچی کردنی فەرمانی خوا لە سەر خۆی دەدات و، ڕێ لە ئیسلام دەگرێت و، بەڕاستی باوەڕی بە خوا نییە.

**جۆرەکانی بەخشین :**

بەخشینیش دوو جۆرە : بەخشینی فەرز و بەخشینی بە خوایشت (تطوع).

بەخشینی فەرزیش دوو جۆرە : بەخشین لە پێناوی خوادا و، بەخشین بەو کەسانەی پێویستیان پێ یەتی.

بەخشینی فەرز ئەوەیە کە هەر دەبێ ئەنجام بدرێت و، دەوڵەت بۆی نییە بۆ پێداویستیی خۆی خەرجی کات، جا ئەوەی ماڵەکەی لەبەردەست دایە ڕازی بێت یان نا، بەڵام بەخشینی بە خوایشت ئەوەیە کە کابرا بە خۆشی خۆی ئەنجامی بدات، بێ ئەوەی کەس تۆبزیی لێ ی بکات.

**بەخشین لە پێناوی خوادا :**

بەخشین لە پێناوی خوادا فەرزە و، هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بۆ بەرزکردنەوەی دینی خوا و، بەرگری لێ کردنی و بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە نێو خەڵکدا و، بەرپاکردنی حوکمەکانی، دەبەخشرێن.. جا هەر کەسێک سامانی

خوای لەبەر دەست دا بێت، لەسەریەتی لەو ڕێ یەدا لێی ببەخشێت و، دەوڵەتی ئیسلامی مافی ئەوەی هەیە بەشی بەرزکردنەوەی دینی خوا، لەو ماڵ و سامانەی لە دەستی خەڵکیدایە، وەربگرێت، ئەوەش سەرف کردنی سامان بۆ خۆئامادەکردن لە دژی دوژمن، یان دەرکردنی، یان بەرزکردنەوەی ئاستی موسوڵمانان بە گشتیی، لە ڕووی زانستی و کۆمەڵایەتی و وەرزشی یەوە، دەگرێتەوە، هەروا بڵاوکردنەوەی ئیسلام و، بەرپاکردنی حوکمەکانی لە نێو خەڵکیدا، ئەوە هەمووی بەخشینە لە پێناوی خوادا، چونکە ئیش کردن لە پێناوی خوادا، گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوا لە جیهادکردن و حوکمڕانی و یەکسانی و دادپەروەریی و شتی دیی دەگرێتەوە.

بەخشینیش لە پێناوی خوادا جیهادە، چونکە جیهاد وەکو چۆن بە گیان دەکرێ، بە ماڵیش و بە هەردووکیشیان پێکەوە دەکرێت و، خوا فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە تێکڕا بە پیر و جوان و هەژار و دەوڵەمەندەوە ڕاپەڕن و، بە سەر و ماڵیان لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن، وەکو دەفەرموێ: ﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُوا بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ: سووکبار بن، یان گرانبار بن، بۆ غەزایە ڕێ دابگرن و، لە گیان و ماڵ بەخت کردن درێغی مەکەن، گەر بزانن هەر بەقازانجی خۆتانە.﴾التوبة:٤١... هەروا خوا جیهادکردن بە سەر و ماڵی، بە نیشانەی ئیمانی مرۆڤ و، بەڵگەی ڕاستیی ئەو ئیمانە داناوە: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ: خاوەن باوەڕ ئەو کەسانەن کە بڕوایان بە خوا و پێغەمبەری هەیە و، تووشی دوودڵیی نەبوون و، بە گیان و ماڵ لەڕێی خوادا تێکۆشاون و، هەر ئەمانە بەڕاستیانە.﴾الحجرات:١٥.

دیارە خوا سەر و ماڵی بە بەهەشت لە بڕوا داران کڕیوە : ﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ: خودا گیان و سامانی باوەڕدارانی کڕیوە

و لەباتیان دەیانخاتە بەهەشتەوە.﴾التوبة:١١١. و، ئەو سەودایەشی بە بازرگانی یەکی بە قازانجی ڕزگارکەر داناوە : ﴿یَاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّکُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِیکُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِیمٍ(١٠)تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِیلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِکُمْ وَأَنفُسِکُمْ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، دەتانەوێ مامڵەیەکتان پێ بێژم کە لە ئازارێکی بەژان ڕزگاروکا؟ بڕوا بەخوا و بە پێغەمبەری ئەو بێنن و، بە دارایی و گیانی خۆتان، لەڕای خودا تێبکۆشن.﴾الصف:١٠-١١. وە سامان نەبەخشین لە پێناوی خوادا، بە خۆ بە هیلاك دان داناوە : ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِیلِ اللَّهِ وَلاَ تُلْقُوا بِأَیْدِیکُمْ إِلَى التَّهْلُکَةِ: ماڵی خۆتان لەڕاهی خودا ببەخشن، خۆشتان بە فەتەرات مەدەن بەدەستی خۆ..﴾البقرة:١٩٥، جا ئەگەر مسوڵمانان لە پێناوی خوادا، بۆ پشتگیری لە دینەکەی و بەرزکردنەوەی، هەرچی هێز و سامانی لە دەستیان دێ، نەیانبەخشێ، ئەوە خۆیان بە هیلاك داوە و، دوژمنیان بە سەر خۆیاندازاڵ کردووە، لە ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری یەوە دەگێڕنەوە، کە گوتوویەتی: بێ گومان ئەو ئایەتە لەسەر ئێمەی کۆمەڵی پشتیوانان(انصار) هاتۆتە خوارێ، کاتێك خوا دەستەڵاتی دا بە ئیسلام و پشتیوانانی زۆر بوون، بە دزیی بە یەکدیمان دەگوت : بەڕاستی ماڵ و سامانەکەمان بە فیڕۆ چوو، ئەوەتا خوا ئیسلامی سەرخست، واچاکە ئەوجار دەست بەماڵەکەمانەوە بگرین و ئەوەی لە دەست چووە، تێی هەڵێنینەوە، جا ئەو ئایەتە بۆ بەرپەرچ دانەوەی ئەو قسەیەی ئێمە هاتە خوارێ و، مەبەست لە خۆ بە هیلاك دان لێرەدا، دەست بە سامانەوە گرتن و زیاد و پەروەردەکردن و نەبەخشینیەتی لە پێناوی خوادا.

جا ڕاستە خوای گەورە ئەو کەسانەی بە سەر و ماڵیان لە پێناوی خوادا جیهاد دەکەن، لەو کەسانەی بە چاکتر داناون کە هەر بە ماڵ جیهاد دەکەن، بەڵام پەیمانی چاکەی بە هەردووکیان داوە : ﴿لاَ یَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِینَ غَیْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِیلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِینَ بِأَمْوَالِهِمْ

وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى: ئەو بڕوادارانەی هەر لە ماڵی خۆیان دەمێنن، جیا لەوانەی نوقوستانن، دەگەڵ ئەوانەی دەچنە جەنگ لەڕای خودا و، ماڵ و گیانیان لەڕێی ئەودا بەخت دەکەن، وەکو یەك نین، خودا غەزاکارانی بەرانبەر بە خانەنشینان بە پلەیەك سەرخستووە، خودا بەڵێنی بە هەموو لایەك داوە کە چاکەیان دەگەڵ دەکا..﴾النساء:٩٥.

جا هەر کەسێك سامانێکی لەبەر دەستدا بێت، دەبێ لە پێناوی خوادا لێی ببەخشێت و، لە پێناوی بەرزکردنەوەی دینی خوا و پاراستنی ئیسلامدا، جیهادی پێ بکات و، ئەوەی جیهاد بە گیانی لە دەست بچێت، نابێ جیهادی ماڵی لە دەست بچێت، چونکە هەر کەسێك نە بەسەر، نە بە ماڵ، جیهاد نەکات و تواناشی هەبێت، ئەوە لە ڕەحمەتی خوا بێ بەشە و خۆی تووشی ئاگری دۆزەخ دەکات، لەسەردەمی پێغەمبەریشداﷺ حەزیان نەدەکرد بە سەر و ماڵیان لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن، خواش قەولی ئاگری دۆزەخی پێدان و، نەیهێشت پێغەمبەرﷺ نوێژ لەسەر مردوانیان بکات، یان بچێتە سەرقەبریان:

﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ وَكَرِهُوا أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَالُوا لاَ تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ(٨١) فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلاً وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ(٨٢)فَإِنْ رَجَعَكَ اللَّهُ إِلَى طَائِفَةٍ مِنْهُمْ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُلْ لَنْ تَخْرُجُوا مَعِي أَبَدًا وَلَنْ تُقَاتِلُوا مَعِي عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُمْ بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ(٨٣)وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ: ئەوانەی بەوە دڵخۆشن کە لە ماڵی خۆیان مان و، لە هاوڕێ بوون دەگەڵ خوا و پێغەمبەری خۆیان بوارد و، نەیانویست گیان و ماڵیان لەڕاهی خودا بەخت کەن و، دەیانگوت: لەم گەرمایەدا وەدەر مەکەون، بڵێ: ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایە، خۆ ئاگری جەهەندەم زۆر گەرمترە. هەرکەسێکیشیان لێ بمرێ، نابێ نوێژی لەسەر بکەی

و، لەسەر گۆڕی ڕامەوەستە، ئەوان حاشایان لە خوا و پێغەمبەر کرد و بەلاڕێیی مردن.﴾التوبة: ٨١-٨٤.

خوای گەورەش بۆ ئەو کەسانەی سامان کۆدەکەنەوەو، لە پێناوی خوا نایبەخشن، ئەشکەنجەیەکی بە ئێشی ئامادە کردووە : ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ: ئەوانەی زێڕ و زیویش کۆدەکەنەوەو، لەڕێی خوادا نایبەخشن، مزگێنی سزایەکی بەئێشیان بدەیە.﴾، ئەوەش ئەو بە هیلاك چوونەیە، خەڵك بە بەخیلی و نەبەخشین لە پێناوی خوادا، خۆیان تێ داوێن.

هەموو مسوڵمانێکیش-مادام هەیبێ لە پێناوی خوادا ببەخشێت- داوای بەخشینی لێ دەکرێت، بەڵام ئەگەر نەبێت، گلەیی لێ ناکرێت و، هەرئەوەندەی لەسەرە، دەربارەی گوێڕایەڵیی خوا و پێغەمبەر و سوود گەیاندن بە کۆمەڵی مسوڵمانان، قسەی خێر بکات و، خوای گەورەش هەر بە قەدەر توانای مرۆڤ ئەرکی دەخاتە سەر و، هیچ مرۆڤێکی چاکەکار _ بە کردەوە یان بە قسە _ بە قەدەر توانای، بە گوناحبار دانانێ : ﴿لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ: لەسەر ئەوانەی بێهێز و لەش بەبار و، ئەوانەی هێندە شك نابەن خێرات بکەن، سووچێك نییە، ئەگەر ئەوان بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی، ئامۆژگاریی خەڵك بکەن، هیچ گلەیی‌یەك لەسەر چاکەکاران نییە، خودا لە گوناحان دەبوورێ و دلۆڤانە.﴾التوبة: ٩١.

بەخشین بەوانەی حەوجێ یان پێیەتی:

بەخشین بەو کەسانەی پێویستیان پێیەتی لەنێو کۆمەڵی ئیسلامیدا، دەکەوێتە خانەی بەخشین لە پێناوی خوادا، چونکە لە پێناوی خوادا، گوێڕایەڵیی خوا دەگرێتەوە، جا هەر بەخشینێکی لە جوغزی گوێڕایەڵیی

خوادابێت، ئەوە لە پێناوی خوادایە، بەڵام ئێمە بۆیە شوێنێکی تایبەتی و ناونیشانێکی سەربەخۆمان بۆ بەخشین بەوانەی حەوجێیان پێ یە دانا، چونکە خوای گەورەش لە چەند دەقێکی تایبەتیدا باسی کردووە، وەکو دەفەرموێ : ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ: کاری چاك ئەوە نیە ڕوو دە ڕۆژهەڵاتێ، یان ڕۆژئاوا بکەن، چاکە ئەوەیە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێب و پێغەمبەرانی خوا هەبێ و، لەو سامانەی کە زۆریشتان خۆشدەوێ، بەشێك بدەن بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و سواڵکەران و، کۆیلانی پێ بکڕنەوە.﴾البقرة:١٧٧.. هەروا: ﴿فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ: کەوایە تۆ بەشی خزم و هەژار و ڕێبواری ئاتاج، وەلا بنێ و، هەر کەس بەشی خۆی بدەیە.﴾الروم:٣٨ و : ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ: دەربارەی دایێ و بابتان و خزمان و هەتیوان و هەژاران و هاوسای دیوار بەدیوار و هاوسای دوور و هەواڵی هەمیشەییتان و، ئەوانەی لە ڕێیە ماونەتەوە، ئەوانەی بوونە ملکتان چاکە بکەن.﴾النساء:٣٦ و : ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ؟ قَالُوا: لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ: چی ئێوەی دە دۆزەخ کێشا؟ دەڵێن: ئێمە لەڕیزی نوێژگەران نەبووین و، خۆراکیشمان بە هەژاران نەدەبەخشی.﴾المدثر:٤١ -٤٤. هەروا : ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا: لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێدەکەن، بە هەژار و بە هەتیو و بە بەدیل گیراوی دەبەخشن.﴾الانسان:٨، ﴿قُلْ مَا أَنفَقْتُمْ مِنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالاَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ: بێژە: هەرشتێ چاك کە دەیبەخشن بیدەن بە دایێ و بابان و بەرخزمانی نزیکتان و هەتیوان و هەژاران و ئەوانەی لەڕێدا ماون.﴾البقرة:٢١٥.

﴿للفُقَرَاء الَّذِينَ أُحصِرُوا فِي سَبِيلِ اللّهِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا: ئەوانە خێریان پێ دەشێ، کە لە خوداپەرستیدا بێدەرەتان ماونەتەوەو هێزی دەرکەوتنیان نیە کە بۆ خۆیان هەوڵێك بدەن، ئەوانەی ئاگایان لێ نین، وا دەزانن هیچ ئاتاج نین، چونکە حەیایان بەخۆیە و، وەکو سواڵکەری دیکە نین بە پارەپاڕ و پێداگریی سواڵ بکەن..﴾البقرة:٢٧٣.

هەروەها: ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ: لە سامانەکەشیاندا بەشێك بۆ سواڵکەر و بێبەشان هەیە.﴾الذاريات:١٩.

بەخشینیش بە هەژاران، فەرزێکە خوا لە ساماندا فەڕزی کردووە و، ئەو بابایەی جێنشینی سەر سامانی خوایە، بۆی نیە قەدەغەی بکات و، حکوومەتان بۆیان هەیە بە قەدەری پێداویستیی هەژاران، سامان لە دەوڵەمەندان بستێنن و، ئەگەر نەیکەن، ئەوە سەرپێچی یان لە فەرمانی خوا کردووە و، نیاز مەندانیان لەو مافانەی خۆیان، کە خوا بۆی فەرز کردوون، بێ بەش کردوون.

نیازمەندان و هەژارانیش مەرج نیە هەر هیچیان نەبێت بۆ ئەوەی موستەحەقی سامان پێ بەخشین بن، بەڵکو مەرج هەر ئەوەیە ئەوەی هەیانە بەشیان نەکات، جا هەرکەسێك داهاتی بەشی نەکات، ئەوە نیازمەند و هەژارە و، حکوومەتی ئیسلامی لە سەریەتی زیادەی سامانی دەوڵەمەندان وەرگرێ و، بیداتە ئەو جۆرە کەسانە.

جا هەروەکو چۆن زەکات پێی دەگوترێ: خێر(صدقە)، بەخشین بە هەژارانیش هەر پێی دەگوترێ (خێر) و، ئەو نیازمەندانەش کە فەڕزە سامانیان بدرێتی، تەقریبەن هەر ئەو کەسانەن لەم ئایەتەدا زەکاتیان بۆ واجب کراوە: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ

وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ: زەکات هەر دەبێ بدرێتە هەژاران و کەمدەستان و ئەو کەسانەی بەسەریڕا دەگەن، بشبەخشرێت بۆ هۆگریی نەیاران و ڕزگارکردنی کۆیلان و قەرزداران لەڕای خودا و لەڕێگابەجێماواندا.. بڕیارێکە لە خوداوە..﴾التوبة:٦٠.. ئەمەش بۆتە هۆی سەر لێ تێکچوونی هەندێك کەس، کە پێیان وایە هەژاران بێجگە لە زەکات، هیچ مافێکیان بە سامانەوە نییە، ئەوەش بێ گومان هەڵەیە، چونکە زەکات تاکە ماف نییە لە سامانداِ بەڵکو یەکەم مافە بۆ هەژاران، جا ئەگەر بەشیان بوو، ئەوە باشە، دەنا دەبێ سامانی دیکەیان بدرێتێ، تا پێداویستیەکانیان دابین دەکات.

باشترین بەڵگەش بۆ ڕاستیی ئەو قسەیە، ئەوەیە کە قورئان لە یەك دەقدا، بەخشین و زەکاتی لێك جیا کردۆتەوە و، هەریەك لەو دووانەی، لەو کارانە داناوە ئیمان دەیانخوازێ و، ئیسلام لە پێناویاندا کار دەکات، ئەوەتا دەفەرموێ : ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَالْمَلائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ: کاری چاك ئەوە نیە ڕوو دە ڕۆژهەڵاتێ، یان ڕۆژئاوا بکەن، چاکە ئەوەیە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێب و پێغەمبەرانی خوا هەبێ و، لەو سامانەی کە زۆریشتان خۆشدەوێ، بەشێك بدەن بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و سواڵکەران و، کۆیلانی پێ بکڕنەوە و، نوێژ بکەن و زەکات بدەن.﴾البقرة:١٧٧

ئەو دەقە بە ڕاشکاوی باسی ئەوە دەکات، کە هەم بەخشین فەڕزە، هەم زەکاتیش.

لێك دابڕینی بەخشین و زەکاتیش بە نوێژ، بەڵگەیە بۆ لێك جیابوونی بەخشین و زەکات و،باسکرانی هەرکام لە بەخشین وزەکات بەجیا لەئایەتێکدا،

ئەوە یەکلا دەکاتەوە کە هەر یەکەیان لەوەی دیکە جیایە و،هەردووکیان دوو واجبی لێك جیان و، ئەوەی بڵێ :زەکات واجبی بەخشینی هەڵوەشاندوەتەوە، ئەوە قسەی بێ بەڵگە دەکات، چونکە زەکات لەمەککە فەڕز کراوە و، ئەو ئایەتەی باسیشمان کرد مەدینەییە، جا چۆن فەڕزی پێشوو، فەڕزی دوای خۆی پێ هەڵدەوەشێتەوە؟ بەڵکو چۆن دەقێك، بەشێکی، بەشێکی دیکەی هەڵدەوەشێنێتەوە؟

هەڵبەتە ڕێوشوێنی(سنة)ی پێغەمبەریش ﷺ وەکو قورئان بەخشین و زەکاتی بەدوو شتی لێك جیاو، هەردوکیانی بەدوو فەڕزی جیاواز داناوە، لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، کە پیاوێکی تەمیمی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت :پێغەمبەری خوا ئەمن سامانێکی زۆرم هەیە وە خاوەن کەس و کارو سامان و داراییێکی زۆرم، پێم بڵێ چی بکەم وچۆن سەرفی بکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی (زەکاتی لێ دەرکە، چونکە پاك کەرەوەیەو پاکت دەکاتەوە و، هاتو چۆی خزمان بکەو و، مافی هەژارو دراوسێ وسواڵکەر بدە)).. ئەوتا پێغەمبەر زەکات وسەردانی خزمان ودانی مافی هەژاران و جیرانان وسواڵکەران، کەخوا بێ جگە لەزەکات فەڕزی کردووە، لێکی جیا کردووەتەوە و، فاتیمەی کچی قەیس گێڕاویەتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سامان، بێجگە لەزەکات، مافێکی دیکەشی تێدایە)) ئەوجار ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ...: چاکە ئەوە نییە ڕوو دە ڕۆژهەڵاتێ، یان ڕۆژئاوایە بکەن...﴾.

کەواتە : بەخشین فەرزێکی سەربەخۆیە و لە زەکات جیایە و، خوا بۆ پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنانەی بە زەکات پڕ نابنەوە، فەڕزی کردووە و، جاری واش هەیە لەوانەیە زەکات پێداویستییی هەژاران دابین بکات، وەکو سەردەمەکانی سەرەتای ئیسلام و، ڕەنگە هەندێك جار لێشیان زیاد بێت، وەکو سەردەمی

عومەری کوڕی عبدالعزیز، کە دەوڵەت کەسی نەدەدیتەوە، زەکاتی بداتێ، جا ئەگەر زەکات پێداویستیی هەژارانی پێ دابین نەکرا، ئەوە بەخشین دەبێتە فەرز بۆ گرتنی ئەو کەلێنەی بە زەکات ناگیرێ.

**بەخشینی لە خۆڕا (طوعي) :**

ئەم جۆرە بەخشینە، لە دوای هەردوو جۆرەکەی بەخشینی واجب دێت و، لێرەدا خاوەن سامان بە کەیفی خۆیەتی، ببەخشێت یان نەبەخشێت، لەبەرئەوە ناومان ناوە بەخشینی لە خۆڕا، پێشی دەگوترێ : خێری لە خۆڕا، کە ئەگەر کەسێك بیکات، خێری دەگاتێ و، ئەگەر نەشیکات، گوناحی ناگاتێ

هەڵبەت ئیسلام خەڵك بۆ بەخشین هان دەدات و، لە پێش چاوی خەڵکی خۆشەویست دەکات و چاکترین پاداشتی بۆ بەخشندان داناوە : ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ: بەسەرهاتی ئەو کەسانەی ماڵیان لەڕاهی خوادا بەخت دەکەن، وەك بەسەرهاتی دنکێکە حەوت گوڵان دەدات و، هەر گوڵەی سەد دانەی تێدایە، خودا چەند ئەوەندە پاداشت دەدا بە هەر کەس کە بیەوێ.﴾البقرة:٢٦١

.. پێشی ڕاگەیاندوون کە ئەو خێرەی بە ماڵ بەخشین دەیکەن، سەرئەنجام بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە : ﴿وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ: هەرچی بەخێر دەیبەشنەوە، بۆ خۆتانە.﴾البقرة:٢٧٢.

هەروا داوای لێ کــردوون لە هەموو کاتێکدا بە شــەو و بە ڕۆژ و، بە نهێنی و ئاشـکرا ببەخشــن و، خێری گەورە و پاداشتی زۆری بۆ دابین کردوون : ﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ: ئەوانەی بەشەو و بەڕۆژ، بەنهێنی و بە ئاشکرا، لەڕێگەی

خوا خێر دەکەن، لای خوا پاداشیان هەیە و، نە هیچ ترسێکیان لەسەرەو نە خەم دەخۆن.﴾البقرة:٢٧٤.

ڕێ و شوێنی پێغەمبەریش ﷺ لە خەڵك هاندان بۆ سامان بەخشین، ڕێبازی قورئان دەگرێتە بەر، وەکو دەفەرموێ : ((ئەگەر بە دەنکە خورمایەکیش بێت، خێر بکەن، ئاوا گوناحان دەکوژێنێتەوە)) و، ((هەر کەسێك لە ماڵێکی حەڵاڵ- خواش هەر ماڵی حەڵاڵ و پاك قبوول دەکات- ببەخشێت، خوا بە دەستی ڕاست لێی وەردەگرێ و، زیادی دەکات، وەکو چۆن ئێوە خورماکانتان زۆر دەکەن تا بە قەدەر کێوی ئوحودیان لێ دێت)) و، ((هەموو کەس لە بن خێری خۆیدا دەبێت-لە ڕۆژی قیامەتدا- تا خوا هەق و حیساب لەگەڵ خەڵکی دەکات)).

ڕاددەی بەخشین :

ئیسلام دوو ڕاددەی بۆ بەخشین داناوە: ڕاددەی ئاسایی و، ڕاددەی پێویست، جا بەخشینەکە چ فەرز بیت، چ لە خۆڕا.

ڕاددەی ئاسایی بەخشین، هەموو ئەو سامانە دەگرێتەوە کە لە پێویستی جێ نشینی سەرسامانە کە زیادە، هەرچی لێی زیاد بێت، و هەرچەندێك بێت، وە بەر بەخشین دەکەوێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ الْعَفْوَ: لێت دەپرسن: چ لە ڕێی خوادا ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی لە پێویستتان زیادە.﴾البقرة:٢١٩، هەروا : ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ: چاوپۆشی بکە و فەرمان بەکاری چاك بدە و، واز لە نەزانان بێنە.﴾الاعراف:١٩٩، (عفو)یش ئەو سامانە دەگرێتەوە و لە پێویستی زیادە و، دوای دابین کردنی پێویستی یەکە چەند هاوەڵێك دەربارەی ڕاددەی بەخشین لە پێغەمبەر ﷺیان پرسی، ئەوانیش لەسەر زمانی سروش(وحي) وەڵامیان درایەوە، کە زیادە (العفو) پێچەوانەی (الجهد-سەختی)یە، بەو جۆرە مەعنای

ئایەتەکە وای لێ دیت : ئەوەی بۆیان ئاسانە و لە دەستیان دێت، دەیبەخشن، کە ئەو شتە دەگرێتەوە، کە لە پێداویستی ی خۆیان زیادە، هەڵبەتە ئەو لێکدانەوە و تەفسیرە، زۆر لە خۆکردنە (تکلف)ی تێدایە و، لەگەڵ دەقە ئاشکراکەدا نایەتەوە و، پێچەوانەی ئەو حەدیسەیە لە پێغەمبەرﷺەوە گێڕراوەتەوە، کە دەفەرموێ: ((ئەی بنیادەم، ئەتۆ ئەگەر ئەوەی لە پێویستی ی خۆت زیادە، ببەخشی، بۆ خۆت چاکترە و، ئەگەر نەیبەخشی، خراپە و، لەسەر ئەوەندەی کە هەر بەشی خۆت دەکات و لێت زیاد نییە، سەرکۆنە ناکرێی)). هەروا پێچەوانەی ئەو حەدیسەشە کە دەفەرموێ: ((خۆشیی لەو کەسەی ئیش بە زانیارییەکەی دەکات و، ئەو سامانەی لە خۆی زیادە، دەیبەخشێ و، قسەی زیاد لە پێویست ناکات))، هەروا لەگەڵ ئەم حەدیسەشدا نایەتەوە : ((سێ جۆرە دەست هەیە: دەستی خوا، کە بەرزترین دەستە، لە دوای ئەو دەستی بەخشندە دێت و، دەستی سواڵکەریش نزمترین دەستە، جا ئەوەی لە خۆت زیادە بیبەخشە و، لە بەرامبەر دەروون (نفس)ی خۆتدا، کەنەفت و بێ توانا مەبە)).. جا ئەوەتا پێغەمبەرﷺ (العفو) بەو سامانە لێکدەداتەوە کە لە خۆت زیادە و، داوای بەخشینی هەمووی دەکات و، داوامان لێ دەکات گلی نەدەینەوە و، بە ڕاشکاوی دەڵێ: ئەو کەسەی بەشی پێداویستی خۆی دێلێتەوە، سەرکۆنە ناکرێت، بەڵکو ئەو کەسە سەرکۆنە دەکرێ، کە ئەوەی لە خۆی زیادە، گلی دەداتەوە.

هەڵبەت هەندێك لە زانایان، پێداویستی بابای جێ نشینی سەر سامانیان، بە پێداویستیی ڕۆژانە لێکداوەتەوە و، هەندێکی دیکەشیان بە پێداویستیی مانگانەیان داناوە و، هەندێکیش بە پێداویستی ساڵانە و، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ ڕۆزیی ساڵێکی بۆ خێزانەکەی پاشەکەوت کردووە.

جا ئەگەر هەرچی لە پێداویستیی جێنشینیی سەر سامان زیاد بێت، وەبەربەخشین بکەوێت، پێویستە بزانین بەخشینی ئەو زیادەیە، تەنها کاتێك دەبێ ئەنجام بدرێت، کە خەڵکی دیکە پێویستیان پێی بێت، ئەگەر کەس پێویستی بەو زیادەیە نەبێت، ئەوە ئەو کەسەی سامانی بە دەستەوەیە، بۆی هەیە بە خۆشی خۆی ئەوەندەی حەزدەکات لێی ببەخشێت، تا دەگاتە هەموو زیادەکە، بەڵام ئەگەر خەڵك پێویستی بەو زیادەیە هەبێت، ئەوە بابای جێ نشینی سەر سامان، بۆی نییە هیچ شتێك لەو زیادەیە هەڵگرێت و، ئەگەر وا بکات، ئەوە هەقی خەڵکی دیکەی زەوت کردووە، ئەوەش تێگەیشتنی ئەبوو سەعیدی خودریی هاوەڵی پێغەمبەری خوایە، کاتێك گوێی لە پێغەمبەر بوو دەیفەرموو : ((هەر کەسێك وڵاخێکی زیادی هەیە، با بیداتە ئەو کەسەی وڵاخی نیە و، هەر کەسێك خۆراکی زیادی هەیە، با بیداتە ئەو کەسەی خۆراکی نییە)).. ئەبوو سەعید دەڵێ: ئەنجا پێغەمبەرﷺ باسی جۆرەکانی سامانی کرد، تا وای لێهات هەموومان زانیمان کەسمان مافی لە زیادەی ساماندا نییە.

دوای ئەوە، دەوڵەتی ئیسلامیش بۆی هەیە لە زیادەی سامانی دەوڵەمەندان هەلبگرێت و، بیداتە هەژاران، با پێویستیشیان پێی نەبێت، ئەوە لە کاتێکدا بەرژەوەندیی گشتیی بیخوازێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ: لەسەر چاکە و پارێزکاریی، یارمەتیی یەکدی بدەن، نەك لە سەر تاوان و غەدر.﴾المائدة:٢.

عومەریشرضي الله عنه کەمێك پێش کۆچی دوایی، هەروا حاڵی بوو بوو، بۆیە فەرموویەتی: ئەگەر بمێنم، سامانی زیادەی دەوڵەمەندان دەستێنم و، دەیدەمە هەژاران، هەڵبەت عومەر لە (بیت المال) بۆ هەموو کەس، تەنانەت بۆ منداڵانیش، بەشی دانابوو و، خەڵك پێویستی بە سامانی دەوڵەمەندان نەبوو، بەڵام بۆیە وای گوتووە، چونکە دەیزانی سامانی دەوڵەمەندان یەکجار زۆر بووە

و، ترسا دەوڵەمەندان تووشی خۆشگوزەرانیی بێسنوور و لەخۆبایی بوون و، هەژارانیش تووشی حەسوودی و لاڕێیی بن، لەبەر ئەوە حەزی کرد بە گێڕانەوەی زیادە ماڵی دەوڵەمەندان بۆ هەژاران، مەسەلەکە هەڵبڕێت و، ئەگەر تەمەنی باقی با و وای کردبا، مێژووی ئیسلام دەگۆڕا.

پێویستیی خەڵکیش بە سامانی زیادە، تەنها بە پێداویستیی تاکەکان بە جیاجیا دیاریی ناکرێت، بەڵکو بە پێداویستیی هەمووشیان بە سەریەکەوە دیاریی دەکرێت، یان دەتوانین بڵێین: پێویستی خەڵك بە سامانی زیادە، بە دابین کردنی پێداویستیی کۆمەڵ لە دوای پێداویستیی تاکەکان، دیاریی دەکرێت و، پێداویستیی یەکانی کۆمەڵیش بێسنوورن و تەواو نابن، چونکە کۆمەڵ تا زیاتر پێشکەوێت و بەهێز بێت، پتر پێویستی بە پێشکەوتن و هێز دەبێت، تا پلە و پایەی لە نێو کۆمەڵانی دیکەدا بپارێزێت و، هەر کاتێك کۆمەڵ فەرمانی خوای بەجێ هێنا، بۆ لەنێوبردنی فەساد و خراپە، سەر لەنوێ پێویستی بە بەجێ هێنانی فەرمانی خوا هەیە.

کەواتە سامانی زیادە، بە دابین کردنی پێداویستیی یەکانی تاك و کۆمەڵەوە بەندە، جا ئەو کەسانەی ئەو سامانە زیادەیان لەبەردەستدایە، بۆیان نییە هیچی بۆ خۆیان بە کار بێنن، دەنا هەقی خەڵکیان خواردووە و، بۆشیان نییە بە کەیفی خۆیان لێی ببەخشن، مەگەر لە دوای ئەوەی هەم تاك و هەم کۆمەڵیش، ماڧ خۆی لێ وەرگرتبێ، هەرچەندە بەخشینی بە خۆشی خۆ(طوعي)، سوودەکەی بۆ خەڵك دەگەڕێتەوە، چونکە خێری بە خۆشیی خۆ، بە ئارەزووی بابای سامان بەخش بەندە و، چۆنی بوێ دابەشی دەکات، بەڵام بەخشینی فەرز، دەبێ تەنها بدرێتە کەسانی خاوەن ماف لەو سامانەدا.

بەڵام ڕاددەی پێویست لە بەخشیندا، ئەوە لە زیادەی سامانەوە دەست پێ دەکات، تا دەگاتە ئەو بەشەی بۆ دابین کردنی پێداویستیی بابای جێ نشینی

سەر سامان خۆی تەرخان کراوە و، خەڵکی دی، تاك و کۆمەڵ، مافی ئەوەیان هەیە کەم و زۆر بۆ دابین کردنی پێداویستیی نیازمەندان و، پاشەکەوت کردنی سامانی پێویست بۆ پارازشی ئاسایشی نێو خۆ و دەرەوەی دەوڵەت، لەو بەشەش هەڵگرن.

هەڵبەت رادەی بەخشین، مەگەر هەندێك پێداویستیی وا بکات، دەنا ناگاتە ئەو سامانەی خاوەن سامانەکەی بۆ خۆی پێویستی پێ یەتی. دەشتوانین لەسەر ئەو پێداویستیانە، چەند نموونەیەك لە سەرەتای سەردەمی ئیسلامدا بێنینەوە:

یەکەم نموونەش لە سەردەمی پێغەمبەرﷺدا بوو، کە فەرمانی بە مسوڵمانان کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچ بکەن، ئەوانیش بە نهێنی کۆچیان کرد و، ماڵ و سامانیان بۆ هاوبەش پەرستانی قورەیش بە جێ هێشت و، کاتێك گەیشتنە مەدینە، زۆربەیان بژیوی یەك رۆژیان شك نەدەبرد، هەڵبەت کۆچەران هەر لە بەر فەرمانی خوا و بۆ جیهاد کردن بە سەر و ماڵیان لە پێناوی خوادا، هەموو ماڵ و سامانی خۆیان بەجێ هێشتبوو : ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ: ئەو دەستکەوتە بۆ ئەو هەژارە دورە وڵاتانەیە کە لە ماڵ و زێدی خۆیان دەرکراون، چاوەڕوانی بەهرە و ڕەزامەندیی خوان و، یاریدەی خوا و پێغەمبەرەکەی دەدەن، ئەمانە ڕاستەکانن.﴾الحشر:٨

جا کاتێك پێغەمبەرﷺ گەیشتە مەدینە، کۆچەران و پشتیوانانی کردنە برای یەکدی و، کۆچەرانی بە سەر پشتیواناندا دابەش کردن و، لە هەرچی هەیانبوو، کەم و زۆر، کردینیە هاوبەش، هەڵبەت سامانی پشتیوانان، بەشی خۆیان و کۆچەرانی نەدەکرد، بەڵام ئەوان بە دڵفراوانیی کۆچەرانیان وەرگرتن و، هەرچەندە زۆریش پێویستیان بەو سامانە هەبوو کە دەیاندانێ، بەڵام ئەوانیان

له خۆیان به له پێشتر دانا، ئەوەشیان تەنها بۆ به دەنگەوەهاتنی خوا و جیهادكردن له پێناوی ئەودا كرد، لەبەر ئەوە شایانی ئەوە بوون خوا دەربارەیان بفەرموێ : ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلاَ يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: ئەو كەسانەش كه بەر لەوان له مەدینه نیشتەجێ بوون و، به دڵ بڕوایان هێنا، حەز بەو ئاوارانه دەكەن كه پەنایان پێهێناون و، بەدڵیش ئێرەیی نابەت بەوەی كه بەوان دراوه و، ئەوانیان پێ له خۆ لەپێشتره، هەرچەنده دەست تەنگیشیان هەیه، ئەو كەسانەی خۆش له رژدیی دەپارێزن، ئەوان ڕزگارەكانن.﴾الحشر:٨.

ئەوه یەكەم نموونه بوو، كه بۆمان دەردەخات بەرژەوەندی ئیسلام پێویستیی كرد كۆچەران دەست له هەموو سامانی خۆیان هەڵگرن، ئەوانیش به دڵی خۆشەوه وازیان لێ هێنا و، هەمان بەرژەوەندی خواستی پشتیوانانیش زۆربەی ئەو شتانەی كه زۆریان پێویست پێ بوون، بكەنه قوربانی و، فەرمانی خوایان بەجێ هێنا و، كۆچەرانیان به له خۆیان له پێشتر زانی.

نموونەی دووەمیش له سەردەمی عومەری كوڕی خەتابدا ﷺ بوو، كاتێك له ساڵی هەشتەمی كۆچیدا برسیەتی بڵاو بۆوەوه و، تینی بۆ خەڵك هێنا، تا وای لێ هات ئاژەڵی كێوی پەنای بۆ مرۆڤ و ئاوەدانی دەهێنا و، خەڵك مەڕی دەكوشتەوه و، لەبەر لەڕ و لاوازیی و خراپیی، وازی لێ دەهانا و نەیدەخوارد، لەو حاڵەدا عومەر له خۆی گرت تا هەموو خەڵك ئەبووژێتەوه، چەوریی و سپیایی و گۆشت نەخوات و، دەیگوت : ((ئەگەر به بەش كردنی خۆراك هەر ماڵێك بۆ دوو بەشی وەكو یەك نەبێ، بەشی بژێوی خەڵكم خۆراك وەدەست نەكەوێ، دەیكەم، چونكه به نیوه تێری نامرن))، ئەوەشی تەنها له دوای داواكردنی یارمەتی له گەورەی شارەكانی گرت و، یەكەم كەس كه به دەنگیەوه

هات، ئەبوو عوبەیدەی جەڕڕاح بوو، کە چوار هەزار بار خواردنی بۆ هێنا و، عەمری کوڕی عاص، بە کەشتی و حوشتران خۆراکی بۆ هێنا و، بیست کەشتی و هەزار حوشتری بە بارە ئاردەوە بۆ نارد، لەگەڵ پێنج هەزار بەرگ و، موعاویە سێ هەزار حوشتری بە بارەوە و سێ هەزار عەبای بۆ نارد و، سەعدی کوڕی ئەبوو وەقاسیش هەزار حوشتری بە بارە ئاردەوە بۆ نارد و، هەموو ئەو شتە بە سەر هەژار و نەداراندا دابەش کرا، بەڵام بە حاڵ بەشی کرد، لەبەر ئەوە عومەر خەریك بوو خۆراکی هەموو ماڵێك بکاتە نیوە و، وا بکات هەموو کەس بە نیوە تێریی بژین.

هەڵبەت عومەر لەم کارەدا ئیلهامی لە گیانی ئیسلام وەرگرتووە و، چاوی لە پێغەمبەرﷺ کردووە، کە کۆچەران وپشتیوانانی کردوونەتە برا و، کۆچەرانی لە ماڵی پشتیوانان دامەزراندووە، تا خوا دەرووی لە کۆچەران کردۆتەوە و، دەستکورتی و هەژاری لە سەر لابردوون.

نموونەی سێیەمیش پاڵەوانەکەی، ئەبوو عوبەیدەی جەڕڕاحە‌رضي الله عنه، کە خۆی و سێ سەد کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر، لە سەفەرێ بوون، هەندێکیان توێشوویان لێبڕا، ئەبوو عوبەیدە فەرمانی پێ کردن هەموو توێشووەکەیان لە دوو ناندیندا کۆبکەنەوە و، دوایی بە یەکسانی بەسەر هەموانیدا دابەش کرد.

بەو جۆرە ئیسلام وا لە خەڵکی دەکات لە تەنگانە و برسیەتیدا و، لە کاتی پێویستیدا، بۆ دابین کردنی پێداویستی و پاراستن و هێشتنەوەیان، دەستی یەکدی بگرن، لەو بارەشەوە لە پێغەمبەر ﷺ ەوە دەگێڕنەوە، کە دەفەرموێ : ((هەر کەسێك بەشی دوو کەسان خواردنی هەبوو، با بەشی کەسیکی دیکەش بدات و، ئەوەی بەشی چوار کەسان خواردنی هەبوو، با بەشی یەك دوو کەسی دیکەش بدات)).

بناوانى هەموو ئەو شتانە، ئەوەيە كە سامان سامانى خوايە و، ئيسلام لەسەر مسوڵمانانى فەرز كردووە، كە بۆ چاكە و لە خوا ترسيى هاوكاريى يەكدى بكەن : ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ: لەسەر چاكە و پارێزكاريى هاوكارى يەكدى بكەن، نەك لەسەر تاوان و دەستدرێژى﴾المائدة/٢.

هەروا ئيسلام، كۆمەڵى ئيسلامى لەسەر بناغەى هاوكاريى كۆمەڵايەتى دادەمەزرێنى و، لە سامانى دەوڵەمەنداندا ماف بۆ هەژاران دادەنێ : ﴿وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ: لە سامانەكەشياندا بەشێكى ئاشكرا بۆ سواڵكەر و بێبەش هەيە.﴾الذاريات:١٩.

﴿فَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ: خزم و نەدار و ڕێبوارى بەجێماو، مافى خۆيان بدەيە.﴾، تەنانەت لە ئيسلامدا هەر كۆمەڵێك كەسێكى برسى تێدا بێت، لە خوا بێ بەشە، وەكوو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((خەڵكى هەر شوێنێك، كەسێكى برسيان لە نێودابێت، ئەوە فريان بە خواوە نييە)).

هەروا ئيسلام مسوڵمانان بە خانوێك دادەنێت كە بەشەكانى، يەكدى بەهێز دەكەن و ڕادەگرن، بەڵكو هەموو مسوڵمانان بە يەك لەش دادەنێت، كە ئەگەر ئەندامێكى تووشى ئازار بێت، هەموو ئەندامەكانى ديكەى گيرۆدەى شەونخوونى و ئێش و ئازار دەبن، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : ((مسوڵمان بۆ مسوڵمان، وەكوو خانووە، بەشەكانى، يەكدى بە هێز دەكەن)) و ((موسوڵمانان لە يەكتر خۆشويستن و بەزەيى پێكداهاتنەوە و هاوسۆزييياندا، وەكو يەك لاشەن، ئەگەر ئەندامێكى ئازارى هەبێت، هەموو لەشەكە دێتە ژان و تووشى شەونخوونى و ئازار دەبێت)).

هەروا ئيسلام لەسەر هەموو موسوڵمانێكى فەرز دەكات، بەزەيى بە براى موسوڵمانيدا بێت و، ستەمى لێ نەكات و پشتى بەر نەدات، هەروەكو

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ : ((ئەوەی بەزەیی بە خەڵكدا نەیەتەوە، خواش بەزەیی پێدا نایەتەوە)) و، ((مسوڵمان برای مسوڵمانە و، نە زوڵمی لێ دەكات و نە پشتی بەردەدات))، جا هەر كەسێك سامانی زیادەی هەبێت و براكەی بە برسیەتی ببینێ و فریای نەكەوێ، بێ گومان خوا بەزەیی پێدانایەتەوە و، هەر كەسێك بە برسی و ڕووتی بە جێ ی بێڵێت و، پشتیوانی خۆراك و پۆشاكی بداتێ، هەڵبەت ئەوە قسەی لەسەر نییە، پشتی بەرداوە.

## قوڵە باسێك :

ئەوە پوختەی بیردۆزەی ئیسلام لەمەڕ خاوەنایەتیی سامان بوو و، ئەوەش ئەو بنەڕەتانە بوون لەسەریان بنیات دەنرێن و، نامانەوێ لەسەریان بڕۆین، چونكە ئەم كتێبە جێی نییە و، هەر ئەوەندەش باسی بیردۆزەی سامانمان كردووە، كە مافی حكوومەتەكان لە سامانی بەر دەستی خەڵكیدا و، مافی خەڵكی لەو سامانەدا، ڕوون بكەینەوە و، هیواداریین خوا سەرمان بخات بۆ دانانی كتێبێكی تایبەتی، تێیدا بە درێژیی باسی بیردۆزەكە و بوارەكانی جێ بە جێ كردنی ئەو تیۆرە ئابوورییە ئیسلامییانەی پێیانەوە بەندن و، ئەو شتانەی لە كۆمەڵی ئیسلامیدا لەو بیردۆزانە دەكەونەوە، بكەین.

# حوکمڕانی و فەرمانڕەوائی خوایە

- حوکمڕانی ئی کێیە ؟
- حوکمڕانی لە ئیسلام دا بەشێکی سروشتی یە
- ئیسلام بیروباوەڕ و ڕژێم «سیستەم» ە
- ئیسلام دین و دەولەتە

# حوکمڕانی بۆ کێیە؟

دوای ئەوەی زانیمان خوا بەدیهێنەر و خاوەنی گەردوونە و، زەویی بە مرۆڤ ئاوەدان کردۆتەوە و، لەسەری کردوونەتە جێنشین و، فەرمانی پێ کردوون بە دوای ڕێڕەوینییەکەی بکەون و، هەر بە قسەی وی بکەن و، بە ئاسانی دەتوانین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، چونکە دوای زانینی ئەو ڕاستییە، هیچ خاوەن مەنتیقێکی ساغ، ناتوانێ ئیعتیراف نەکات کە حوکم هەر بۆ خوایە و، مادام خوا بۆ خۆی بەدیهێنەر و خاوەنی گەردوونە، هەر بۆ خۆشی تێیدا فەرمانڕەوا و حاکمە و، لەسەر مرۆڤ پێویستە گوێڕایەڵی ئەو پەیامە بن، کە ناردوویەتە خوارێ و، حوکمی پێ بکەن، چونکە لە لایەکەوە، ئەوان بەو مەرجە کراونەتە جێنشینی سەر زەویی، کە پێڕەویی لە ڕێڕوونیی خوا بکەن و، لە سەرێکی دیکەشەوە، جێنشینی خوان لەسەر زەوی و جێنشینیش بۆی نییە لە فەرمانی ئەوکەسەی کردوویەتی بە جێنشین، دەرچێت...

هەڵبەت دەقەکانی قورئانیش، پشتگیریی ئەو مەنتیقە ساغەی مرۆڤ دەکەن و، مرۆڤ وا لێ دەکەن پێڕەویی لەو پەیامە بکات لە خواوە هاتووە و، پێڕەویی کردنی شتی پێچەوانەی پەیامی خوا بە یەکجاری لێ قەدەغە کردوون:

﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ: هەر فەرمانێکی لە پەروەردگارت ڕا بۆت دێ، پێکی بێنە، بە غەیرەز ئەو، کەس بۆ پەرستنێ ناشێ و، تۆ واز لەوانە بێنە شەریک بۆ خوا پەیدا دەکەن.﴾الانعام:١٠٦

﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ: هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان نێرراوەتە خوارەوە، شوێنی کەون و، لەوی بەدەر مەکەونە شوێنی سەرپەرشتانی دیکە..﴾.الاعراف:٣

خواش فێری کردووین، کە هەق شتێکە و بەش بەش ناکرێ و، لە دنیادا تەنها هەق و ناهەق هەیە و، هەر شتێکیش کە هەق نەبوو، ناهەقە : ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلاَّ الضَّلاَلُ: لەپاش ڕاستیی چ شتێك هەیە بێجگە لە گومڕایی؟ دەی چۆن لە ڕاستیی لا دەدرێن.﴾یونس:٣٢. هەروا فێری کردووین کە محمدی نێردراوی خۆی ﷺ بە هەق ناردووە : ﴿إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا: ئێمە تۆمان بە تێڕادیویی ناردوە، کە مزگێنیش بدەی و بیشـــیان ترسێنی.﴾البقرة:١١٩... ئەو کتێبەی بۆشی ناردووە، هەر بە هەق بۆی ناردووە : ﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ: کتێبی بە هەق و ڕاستی بۆ تۆ ناردۆتە خوار.﴾آل عمران:٣، ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ: ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ تۆ ناردۆتە خوار، کە هەرچی تێیدایە ڕاستە.﴾النساء:١٠٥.

جا ئەگەر خوا پێغەمبەرەکەی بە ڕێڕوونیی و دینی ڕاســتەوە ناردبێت : ﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ: خوا ئەوەیە کە پێغەمبەری بە ڕێنوێنی و دینی ڕاستەوە ناردوە.﴾التوبة:٣٣، ئەوە ئەو کەسانەی بە دەنگ پێغەمبەرە و ئەو پەیامەوە کە هێناویەتی، دەچن، ئەوە بە دەنگ هەقەوە دەچن و، پێڕەویی لە ڕێڕووێنیی دەکەن و شوێنی دەکەون، بەڵام ئەوانەی گوێ نادەنە پێغەمبەر و ئەو هەقەی هێناویەتی، ئەوە بە دەنگ ناهەقەوە دەچن و، بە دوای ئارەزووی خۆیان دەکەون و، گومڕاترین کەسیش ئەوەیە کە بە دوای ئارەزووی خۆی بکەوێت : ﴿فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ: ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە، بزانە کە ئەوانە پێڕەوی ئارەزویانن،

کێش خوا شارەزای نەکات و، پێڕەوی ئەلهای دڵی بێ، کەسی لێ گومڕاتر نیە، خواش ستەمکاران شارەزای ڕێگا ناکات.﴾القصص:٥٠.

خواش ئەوەی بۆ پێغەمبەرەکەی ناردووە، کردوویەتە بەرنامەی ژیانی ئێمەو، لە سەری پێویست کردووین، شوێنی بکەوین و، پابەندی ڕێ و شوێنەکانی بین و، لێی قەدەغە کردووین بە دوای یاسای مرۆڤ بکەوین و پابەندی یاسادانانی مرۆڤ کرد بین، چونکە ئەو یاسا و دەستوورانە، تەنها هەوا و ئارەزوو و سەرکوێریی خۆیانە، لە شێوەی یاسا و دەستووراندا دایدەڕێژن و، خەڵکی یان پێ گومڕا دەکەن و، لە بەرنامەی خوایان لادەدەن و، هەرچەندی بزانن و فێر بن، لە چاو زانیاری خوا، کە هەموو شتێك دەگرێتەوە، هەر هیچ نازانن و، هەر خواشە دەزانێت ڕێنوێنی و خێر و خۆشیی مرۆڤ بێنێتە دیی: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ: دواجار ئەتۆمان خستە سەر ڕێگە و شوێنێك لەم ئایینە، شوێنی کەوە و شوێنی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.﴾الجاثية:١٨.

ئەو بەرنامەش کە خوا بۆ پێغەمبەری ناردووە و، لەسەری پێویست کردووین شوێنی بکەوین و ئیشی پێ بکەین، تەنها ئەو کتێبەی خوایە کە بەیانیان و ئێواران مســـوڵمانان دەیخوێننەوە و، گوێی لێ ڕادەگرن : ﴿وَهَذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ: ئەم کتێبە پیرۆز و پڕ پیتەشمان ناردۆتە خوار، گشتو پێڕەوی لەو بکەن و، ترسیشتان لە خودا هەبێ، بەشکو بەزەیی پێودابێ.﴾الأنعام:١٥٥، ئەو کتێبەش قورئانی پیرۆزە : ﴿كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ: کتێبێکە نیشانەکانی بە ڕوونی شی کراونەتەوە، بە زمانی عەرەبیە بۆ کۆمەڵێك کە بزانن.﴾فصلت:٣.

دەقەکانی پێشوو سەلماندیان کە لە وڵاتانی مسوڵمانانیشدا، دەبێ حوکم و فەرمانڕەوایی بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام بێت، چونکە شوێنکەوتنی ئەوەی

خوا ناردوویەتە خوار، دەخوازێت حوکم بەوە بکرێت کە خوا ناردوویەتە خوار و، فەرمانڕەوایان ئەمری خوا بەجێ بێنن، چونکە ئەگەر هەندێك کەس پشتیوانن بەش بە حاڵی خۆیان و ئەوەی لە دەستیاندایە، پێڕەویی لە فەرمانی خوا بکەن، ئەوە لەو شتەدا کە پێوەندی بە خەڵکی دیکەوە هەیە و، لە دەستی ئەواندایە، ناتوانن پێڕەویی لە فەرمانی خوا بکەن و، ئەگەر لە کاتی تەبایی و کۆکیشدا بتوانن بە دوای فەرمانی خوا بکەون، ئەوا ناتوانن لە کاتی ناکۆکیدا پێڕەویی لێ بکەن و، ئەگەر توانیشیان وەکو تاك لەو شتەی ئی خۆیانە، بە پێی فەرمانی خوا کاربکەن، چۆن دەتوانن لەو شتەدا پێوەندیی بە فەرمانڕەوایانەوە هەیە، وابکەن، ئەگەر فەرمانڕەوایان بەو شتەوە، کە خوا ناردوویەتە خوار، پابەند نەبن؟ ئەوەندە بەس بوو کە بزانین خوا لە سەری پێویست کردووین لە کاتی ناکۆکی و دووبەرەکیدا، بەرنامەی خوا بکەینە داوەر و، لە مەڕ ئەو شتەی ناکۆکی و دووبەرەکی لەسەرە، حوکم بە یاسای خوا بکەین : ﴿فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ: ئەگەر لە شتێکدا تێك گیران، ئەوا حەواڵەی خوا و پێغەمبەری کەن.﴾النساء:٥٩، ﴿ وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِنْ شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ: لەسەر هەرچی پێك نەهاتن، خوا بە ناوتان ڕادەگات.﴾الشوری:١٠.. بەس بوو ئەوەندە بزانین بۆ دڵنیابوون لەوەی کە حوکم هەر بۆ خوایە و، کاربەدەستان و مسکێنان دەبێ لە هەموو ولاتێکی مسوڵمان نشیندا، لە هەموو هەڵس و کەوت و ڕێ و شوێنێکیاندا پابەندی ئەو پەیامە بن کە خوا ناردوویەتە خوار و، کتێبی خوا بکەنە دەستوور و یاسای باڵایان. بەڵام خوای گەورە کە دەربارەی مرۆڤ لە هەموو کەس زاناترە و، دەزانێ کە لە هەموو شتێك زیاتر گفتوگۆ و مشتومڕ دەکات، چەند دەقێکی بۆ ناردووین بە تەواویی یەکلایان کردۆتەوە، کە حوکم و فەرمانڕەوایی لە دنیا و قیامەتدا هەر بۆ خوایە : ﴿وَهُوَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَهُ الْحَمْدُ فِي الأُولَى وَالآخِرَةِ وَلَهُ الْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ: خوا هەر ئەوە و بێجگە لەوی کەسی

شیاوی پەرستن نییە، لە دنیا و لە قیامەتیش سوپاس هەر تایبەتی ئەوە، فەرمان هەر فەرمانی ئەوەو، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە.﴾القصص:٧٠ و، بۆمان دەردەخەن کە خوا، پێغەمبەرانی تەنها بە مژدەدەر و ترسێنەریی ناردووە و، کتێبەکانی هەر بۆ ئەوە ڕەوانە کردوون تا خەڵك لە ژیاندا بیانکاتە یاسا و، بیانکەنە فەرمانڕەوا و، لەسەر لەبەری ژیانیاندا حوکمیان پێبکەن : ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ: بەرێ خەڵك هەمووی چین و بەرەیەك بوون، خودا پێغەمبەرانی ناردن مژدەدەر و ترسێنەر بن، کتێبی ڕاست و ڕەواشی ڕەگەڵ خستن، ئەو شتانەی بوونە مایەی کێشەیان، بۆیان یەکلاکەنەوەو پێکیان بێنن.﴾البقرة:٢١٣.

لەو دەقە یەکلاکەرەوانە وە تێدەگەین کە خوا قورئانی بۆ پێغەمبەر ﷺ ناردووە، تا ببێتە دەستوور و یاسای باڵای مرۆڤایەتی و، پێغەمبەریش بە گوێرەی حوکم و ڕێ و شوێنەکانی، وەکو خوا فێری کردووە، حوکم لە نێو خەڵکیدا بکات : ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ: ئەم کتێبەمان بۆ ناردووی، کە هەرچی تێیدایە ڕاستە، تا حوکم بەو شتە بکەی کە خوا پیشانی داوی.﴾النساء :١٠٥.

تێشدەگەین لە خوای باڵا دەست بەندەکانی بە بێ ئیمان داناون و، سوێندیشی لەسەر خواردووە، تا ئەو کاتەی بۆ هەڵبڕینی کێشە و ناکۆکیەکانی نێوانیان، پێغەمبەر دەکەنە داوەر، بە گوێرەی حوکم و بەرنامەی خوا، حوکمیان لە نێودا بکات، هەر بەوەندەش بە باوەڕداری حیساب کردوون، بەڵکو سەرهەڵنەدانی هیچ جۆرە ناڕەحەتی و وەتەنگ هاتنێکیشی سەبارەت بە داوەریی و حوکمی پێغەمبەر و، تەسلیم بوون و گوێ ڕایەڵیی تەواویانی، بە مەرجی باوەڕدار بوونیان داناوە، هەڵبەت پێغەمبەریش تەنها بە گوێرەی

ڕێڕوویێنی و بەرنامەی خوا و ئەوەی خـوا نیشـانی داوە، حـوکـم دەکـات : ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا: جا سوێند بە پەروەردگارت، ئیمانیان تەواو نابێ تا تۆ نەکەنە فەرمانڕەوا بۆ هەڵبڕینی کێشەکانی نێوانیان و، لە پاشانیش هیچ خوتخوتە و گرێ و گۆڵێکیان لەوەمەڕ فەرمانڕەوایی‌یەکەت لە دڵدا نامێنێ و، بە تەواویی بۆی ملکەچ دەبن.﴾النساء :٦٥.

هەروا لەو دەقە یەکلاکەرەوانەوە تێدەگەین کە خوا فەرمانی کردووە خەڵك پەیام و بەرنامەی خوا بکەنە حاکم و فەرمانڕەوای خۆیان و حوکمی پێبکەن و، خەڵکی دەنگ داوە کە نەکەن شوێنی ئارەزووی خۆیان بکەون و حوکمی پێبکەن و، فەرمانی کردووە هەموو جۆرە فەرمانڕەوایی و حوکم کردنێك، بە پێی سروش(وحی)ی خوا بێت و، بابای فەرمانڕەواشی وریاکردۆتەوە کە نابێ دەسـتبەرداری هەندێك لە یـاسـا و بەرنامەی خوا بێت، یان لێی لادات: ﴿فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنْ الْحَقِّ: جا بە گوێرەی ئەوەی خوا بۆی ناردوویە خوار حوکمیان لەنێودا بکە و، نەکەی لەو ڕاستی‌یەی بۆت هاتووە لادەی و، بکەویە شوێن ئارەزووی ئەوانت.﴾المائدة:٤٨.

﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ: تۆش بەپێی ئەوەی خوا ناردوویەتە خوارێ لەنێویاندا حوکم بکە و، دوای ئارەزوویان مەکەوەو، ئاگات لەخۆ بێ لە هەندێك لەو شتەی خوا بۆی ناردویە خوار، لامەدە.﴾المائدة:٤٩، ﴿وَكَذَلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا وَلَئِنْ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُمْ بَعْدَمَا جَاءَكَ مِنْ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلاَ وَاقٍ: ئێمە ئەم فەرمانەی خۆمان بە عەرەبی بۆ تۆ نارد، ئەگەر لەدوای ئەو زانستەی بۆ تۆ هاتووە، شوێن ئارەزووی ئەمان کەوی، ئیتر نە خودا یارتە و نە پارێزگاریشتە.﴾الرعد:٣٧.

هەر لەو دەقانەوە تێدەگەین کە خوا حوکم کردن بەوەی ناردوویەتە خوارێ، بە چاکترین و شیاوترین حوکم دادەنێت و، ئەو جۆرە حوکمەی بە حوکمی خۆی ناوبردووە و، بێجگە لەویشی بە حوکمی نەفامیی داناوە، کە لەسەر ناهەق ڕاوەستاوە و، ئەو کەسەی داوای حوکمی غەیرە خوایی دەکات، وای حیساب دەکات، کە داوای حوکمی جاهیلیەت دەکات، کە بناغەکەی لەسەر ئارەزوو و گومڕایی‌یە:

﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: ئایا داوای فەرمانڕەوایی نەفامیی(جاهلية) دەکەن؟ باشە، فەرمانڕەوایی کێ لە ئی خوا چاکترە بۆ ئەو کۆمەڵەی لە ئیمانیاندا هیچ گومانیان نیە.﴾المائدة:٥٠.

هەر ئەو دەقانەش بۆمان دەردەخەن کە خوا حوکم کردنی بە غەیری ئەوەی ناردوویەتی، حەرام کردووە، وەکو حەرام کردنی کوفر و زوڵم و لاڕێ یی و یاخی بوون و، خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردویەتیە خوارێ، ئەوە کافرە.﴾المائدة:٤٤. ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردویەتیە خوارێ، ئەوە ستەمکارە﴾المائدة:٤٥. ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: هەرکەسێکی حوکم بەوە نەکات کە خوا ناردویەتیە خوارێ، ئەوە لەڕێ لایداوە﴾المائدة:٤٧.

هەڵبەت قورئانیش کوفری بە زوڵم داناوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ: بەڕاستی هاوەڵپەرستی ستەمێکی زلە.﴾لقمان:١٣ و، ﴿وَالْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ: کافرانیش ستەمکارن﴾البقرة:٢٥٤. و ﴿وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلاَّ الظَّالِمُونَ: تەنها ستەمکاران ئینکاریی نیشانە و بەڵگەکانی ئێمە دەکەن.﴾العنكبوت:٤٩.. هەروا قورئان کوفر و زوڵمی بە لاڕێ بوونیش داناوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَمَا يَكْفُرُ بِهَا إِلاَّ

الْفَاسِقُونَ: هەڵبەت ئێمە چەند نیشانە و بەڵگەیەکی ئاشکراشمان بۆ ناردوی و، تەنها لەڕێلادەران باوەڕیان پێناکەن.﴾البقرة : ٩٩ و، ﴿إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ: بەڕاستی ئەوان ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەرەکەی نەمێنا و بە لاڕێیی مردن.﴾التوبة:٨٤ و، ﴿وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: هەرکەسێك لەدوای ئەوەش هەر باوەڕ نەهێنێ، ئەوە لەڕێلادەرە.﴾النور:٥٥ و، ﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ: ﴾البقرة:٥٩ و، ﴿وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا بِعَذَابٍ بَئِيسٍ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ: جا لە ئاسمانەوە سزایەکمان بۆ سەر ستەمکاران نارد، بەهۆی ئەوەی کە لەڕێ لایاندابوو.﴾الأعراف:١٦٥.

جا ئەگەر زوڵم و لارێ بوون، کوفر بێت، ئەوە لاڕێ بوون و زوڵمی ئەو کەسەی حوکم بەوەی خوا ناردوویەتە خوارێ ناکات، دەبێتە کوفر و، ئەو کەسەش کە حوکم بەوەی خوا ناردوویەتە خوارێ ناکات، لە هەموو بارێکدا، بە دەقی قورئان دەبێتە کافر.

بەڵام هەندێك لێکدەرەوە(مفسر)ی قورئان، زوڵم بە لەهەق لادان لێك دەدەنەوە و، لاڕێ بوونیش بە یاخیبوون و، هەرسێك ئایەتەکان وێکڕا لێکدەدەنەوە و، پێیان وایە هەر مسوڵمانێك چەند حوکمێکی غەیرە خوایی دابێنێت و، حوکم بەوان بکات و، بەبێ تەئویلێکی پێی ڕاست بێت واز لە هەندێك لەوەی خوا ناردوویەتی بێنێت، ئەوە فەرمایشتی خوای بەسەردا دەچەسپێ، هەرکەسە بە گوێرەی خۆی، ئەوەی واز لەوەی خوا ناردوویەتی بێنێت و، یاسای دەستکردی مرۆڤی پێ چاکتر بێت، ئەوە بێ ئەم لاو لا کافرە و، ئەوەی حوکم بە بەرنامەی خوا نەکات، بەڵام سپڵە و پێنەزان نەبێت و، هەر ئەوی پێ لە بەرنامەی دەستکرد چاکتر بێت، ئەوە ئەگەر لە حوکم و فەرمانڕەوایی یەکەیدا مافخوران و بێدادیی و نایەکسانیی هەبوو، زاڵمە، دەنا لاڕێ بوو (فاسق)ە.

# حوکمرانی له ئیسلام دا، شتێکی سروشتی یه

ئەوانە چەند دەقێکی قورئانن کە باسی حوکم کردنیان کردووە و، دوای ئەو باسەی پێشەوە، کەس ڕێی مشتومڕ و هەنجەتی نامێنێ، جا با مسوڵمانان شارەزای داب و دەستووری ئایینەکەیان و، دەقەکانی بەرنامەکەیان بن، ئەوجار هەر شتێکی وەری دەگرن، یان وەلای دەنێن، بە بەرچاو ڕوونیی بێت، بەڵام ئەگەر بچن کوێرانە وەدوای شاگردانی ڕۆژهەڵاتناسان و کلکەکانی ئیمپریالیزم کەون و، وەکو ئەوان بڵێن: ئیسلام پێوەندیی بە حوکم و فەرمانڕەوایی یەوە نییە و، هیچ دەقێکی تێدا نییە باسی حوکم بکات، ئەوە نەزانی یەکی تەواو و مشتومڕێکی خۆگێل کەرانەیە، ئاخر چ نەزانی یەك لە نەزانیی بابایەك زیادترە لاف خەسڵەتێك لێ بدات و نەشزانێ چییە، خۆی پێ مسوڵمان بێت و، نەشزانێ ئیسلامەتی چییە؟! هەروا چ شەڕە قسە و مشتومڕێك، خۆ گێل کەرانە ترە لە مشتومڕی کابرایەکی نەفام، نەزانی‌یەکەی لەسەر خەڵك بکاتە بەڵگە و، داوایان لێ بکات ئینکاری ئەوەی دەیزانن بکەن، هەر چونکە بۆ خۆی نایزانێت، یان نایەوێ فێری بێت؟!!

ئیسلام لەسەر خەڵکی پێویست دەکات، پەیڕەوی ئەوەی خوا ناردوویەتی بکەن و، لەسەریان واجب دەکات ئەوەی لە خواوە هاتووە، لە نێو خۆیانیدا بکەنە داوەر و، تەنها و تەنها حوکم بەوی بکەن، ئەمەش تەنها ئەوە دەردەخات، کە حوکم و فەرمانڕەوایی، بنەڕەتێکی گشتگیری ئیسلامە و، یەکەم کۆڵەکەی ڕاگرتنی ئیسلامە.

هەر کەسێك لە ئیسلام شارەزابێت، سووڕ دەزانێ کە حوکم کردن لە ئیسلامدا، پتر لەوەی دەقەکانی قورئان داخوازیی دەکەن، سروشتی ئیسلام

داخوازيى دەكات، چونكە ئەوە سروشتى ئيسلامە كە چاودێرى تاكەكان و كۆمەڵەكان بكات و، ڕێ و شوێنيان بۆ دانێت و، هەڵس و كەوتيان ڕێك بخات و، هەر سروشتى ئيسلاميشە كە بەرز و باڵادەست بێت و هيچى بە سەردا باڵادەست نەبێت و، فەرمانڕەوايى ى خۆى بەسەر دەوڵەتەكاندا بچەسپێنێ و، دەستەلاّتى بەسەر هەموو دنيادا هەبێت.

بێ گومان ئيسلام هەر بير و باوەڕ نى يە بە تەنێ، بەڵكو بيروباوەڕ و ڕژێمە و، تەنها هەر دين نييە، بەڵكو دين و دەوڵەتە و، بەڕاستى زۆر ناخۆشە كە زۆربەى مسوڵمانان ئەو ڕاستى يە نازانن، چونكە هيچ لە حەقيقەتى ئيسلام نازانن و، پێيان وايە تەنها چەند خوا پەرستى يەكە، بە لاساكردنەوە و چاولێكەريى فێرى دەبن.

## ئيسلام بيروباوەڕ و ڕژێم و سيستەمە

گومان لەوەدانييە كە ئيسلام بيروباوەڕ و مەبدەئە، بەلاّم تەنها لە دواى ئەوەى وەك ڕژێم و ياسايەكى وردى هەمەلايەنە كە هەموو كاروبارێكى دەروونى مرۆڤ ڕێك دەخات و، هەموو بير و بۆچون و هەستێكى مرۆڤ، چ پەيوەنديى بە تاكەوە هەبێت، چ كۆمەڵ و، چ بەو دنيايەى تێيدا دەژێن، چ بە ژيانى دواڕۆژەوە، كە بە ئومێدين ژيانێكى چاك و خۆش بێت، بەند بێت، ڕێك دەخات... دەبێتە بيروباوەڕ و مەبدەئێك كە خەڵك باوەڕى پێ بێنێ...

جا ئيسلام، بيروباوەڕەكەى، باوەڕ هەبوونە بە خوا و فريشتەكانى و كتێبەكانى و نێرراوەكانى و ڕۆژى قيامەت، بەلاّم ڕژێم و دەستوورەكەى تەواو دەست بەسەر مرۆڤدا دەگرێت و، ڕێباز و ئامانجى ژيانى بۆ ديارىى دەكات، هەروا ئەو ڕێگايانەى ئيش كردنيشى، كە دەيگەيەننە بەختەوەريى دنيا و قيامەت، بۆ ديارىى دەكات.

ڕژێمی ئیسلام له هەموو جووڵە و جێگیربوونێکیدا دەست بەسەر مسوڵماندا دەگرێ، له بیر کردنەوە و نیازی، له گوفتار و کرداری، دەستی بەسەردا دەگرێت، له نهێنی و ئاشکرای و دیارنەبوون و دیاربوونیدا، دەستی بەسەردا دەگرێ، له هەستان و دانیشتنی و نوستن و بێدارییدا، دەستی بەسەردا دەگرێ، له خواردن و خواردنەوەی و پۆشاك خۆڕازاندنەوەیدا، دەستی بەسەردا دەگرێت، له کڕین و فرۆشتنی و ڕەفتار و هەڵس و کەوتیدا، دەستی بەسەردا دەگرێت، له شتی به ڕاستی و گاڵتەیدا و له دڵخۆشیی و دڵتەنگیدا و له قایل بوون و توورەبوونیدا، دەستی بەسەردا دەگرێت، له تەنگانە و خۆشیدا و له نەخۆشیی و ساغیدا و، له لاوازیدا و بەهێزیدا، دەستی بەسەردا دەگرێت، به دەوڵەمەندیی و هەژاریی و گەورەیی و مەزنیی و سووکیی، دەستی بەسەردا دەگرێت، له منداڵ و خێزانیدا و، له دۆستایەتی و دوژمنایەتیدا و، له ئاشتی و شەڕیدا، دەستی بەسەردا دەگرێت، به تاکیی و به کۆمەڵیی و به سەرداریی و به مسکێنیی و، به دارایی و به نەداریی، دەستی بەسەردا دەگرێت و، هەر ڕەفتارێك به بیری مرۆڤدا بێت، یان هەر حاڵەتێك مرۆڤی تێدا بێت، ئیسلام تێیدا دەستی بەسەر مسوڵماندا گرتووە و، به گوێرەی ئەو نەخشەی بۆی داناوە و ئاڕاستەی کردووە.

ئەوانەی پێشیان وایە ئیسلام هەر بیروباوەڕە و، ڕژێم و یاسا نییە، یان نەزانن و هیچ له ئیسلام حاڵی نین، یان گەمژەن و ناتوانن له حەقیقەتی ئیسلام تێ بگەن، چونکە ئیسلام له ڕاستیدا بارودۆخێکە، خوا بەسەر بەندە باوەڕدارەکانی خۆیدا دێنی و : ﴿صِبْغَةَ اللَّهِ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ صِبْغَةً: ڕەنگێکە خوا ڕشتویەتی و، کێ هەیە لەخوا چاکتر ڕەنگ بڕێژێ؟!﴾البقرة:١٣٨ و، هیچ مسوڵمانێك بەبێ بەسەردا هاتنی ئەو بارودۆخە و، ڕەفتار کردنی خۆی و ماڵ و منداڵی به گوێرەی ئەو بارودۆخە، به مسوڵمان دانانرێت.

لەوانەش نەزان و گێل تر ئەو کەسانەن، کەوا دەزانن بەرژەوەندیی ئیسلام لەوەدایە پارێزگاریی لە بیروباوەڕی ئیسلام بکەن و، ڕژێم و یاساکەی وەلانێن، چونکە عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلام، تەنها لەبەر سێبەری ئەو ڕژێمە ئیسلامییەی بەدیهێنەری هەرەزانا داینساوە، دەژی و بڵاودەبێتەوە.

جا من نازانم ئەو جۆرە کەسانە، چۆن باوەڕیان بە بیروباوەڕی ئیسلام هەیە، بەڵام باوەڕیان بە ڕژێم و دەستوورەکەی نییە، ئایا پێیان وایە بیر و باوەڕەکەی لە خواوەیە و، ڕژێم و دەستوورەکەی لە غەیری خواوە یە؟!

﴿قُلْ: كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا: بێژە: هەموی هەر بەدەس خوایە. ئەرێ ئەم مەردمە چیانە؟ وەکو دەهیچ قسەیەك تێنەگەن وایە.﴾النساء:٧٨.

ئەو خوایەی ئیسلامی کردۆتە دین، هەر ئەویش کردوویەتە بیروباوەڕ و ڕژێم و دەستوور و، خوا قایل نییە خەڵك بێجگە لەو دینە پێڕەویی لە هیچ دینێکی دیکە بکەن : ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ: هەرکەسێکی بێجگە لە ئیسلام پێڕەوی لە دینێکی دیکە بکات، ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و لە قیامەتیشدا لە دۆڕاوانە.﴾ال عمران:٨٥.

هەڵبەت خوا دینی ئیسلامی تەواو کردووە و، بە تەواو کردنیشی نیعمەتەکانی خۆی لەسەر خەڵکی تەواو کردوون و، ڕازی بووە ببێتە بەرنامەی ژیانی خەڵکی و، بۆیان نییە لێی زیاد و کەم کەن و بۆیان نییە بێجگە لەوەی خوا پێی قایلە، بە خۆیانی ڕەوا ببینن و پێی قایل بن : ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە دینەکەتانم تەواو کرد و، بەبێ کەم و کورتی چاکەم دەگەڵ ئێوەدا کرد و، ئیسلامیشم کردە دینی ئێوە.﴾المائدة:٣ جا ئەگەر خوای گەورە دینی ئیسلامی هەڵبژاردبێت و، ڕازی بێت بیروباوەڕ و یاسا و ڕژێمی خەڵکی بێت، چۆن بابای بڕوادار بۆی هەیە لێی

هەڵبژێرێت، له کاتێکدا خوا هەڵبژاردنی لیّ قەدەغه کردووه : ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ: ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەی فەرمانیان به کارێك دا، هیچ پیاوێك و هیچ ژنێکی خاوەن باوەڕ، ناتوانن پەسندی نەکەن..﴾الأحزاب:٣٦.

باشه، ئەوانه نازانن که حوکم و یاساکانی ئیسلام بەش بەش ناکرێن و، لێك دابڕان هەڵناگرن و، دەقەکانی پشتگیریی لەوه دەکەن، ئیش به هەندێکیان بکرێت و، هەندێکیشیان پشت گویّ بخرێن، هەروا قەدەغەی کردووه باوەڕ به هەندێکیان بکرێت و به هەندێکیان نا و، خوای گەورە هەڕەشەی ڕیسوا کردن له دنیادا و، سزای توند و تیژی قیامەتی لەو کەسانه کردووه وا دەکەن؟!

﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ فَمَا جَزَاءُ مَنْ يَفْعَلُ ذَلِكَ مِنْكُمْ إِلاَ خِزْيٌ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرَدُّونَ إِلَى أَشَدِّ الْعَذَابِ: ئایا باوەڕ به بەشێکی کتێبەکەتان دەکەن و، باوەڕ به بەشێکی ناکەن؟ هەرکامێکتان وابکات، ئەوه پاداشتی له دنیادا هەر ڕیسوابوون و، له ڕۆژی قیامەتیشدا تووشی توندترین ئەشکەنجه دەکرێن.﴾البقرة:٨٥.

هەندێك کەس له سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ، داوایان له پێغەمبەر کرد دەست له هەندێکی ئەوەی له خواوه بۆی هاتووه هەڵگرێت و، به جۆرێك که لەگەڵ ئارەزووی ئەواندا بێتەوه، ئەوەبوو سروش هاته خوارێ، فەرمانی به پێغەمبەر کرد دەست بەوەی خوا ناردوویەته خوارێ، بگرێت و، داوای لیّ کرد تخوونی پەیڕەویی کردنی ئارەزووی ئەو لاڕێبووانه نەکەوێت و، تێی گەیاند که حوکم کردن به گوێرەی ئارەزوو، حوکمی جاهیلیەته و، چاکترین و شیاوترین حوکم ئەوەیه خوا بۆ بەندەکانی خۆی هەڵبژاردووه : ﴿وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ(٤٩) أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ

وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ: تۆش بەپێی ئەو فەرمانەی خوا ناردویەتە خوارێ، بە کاروباریان ڕابگە و، مەکەوە شوێن ئارەزویان، خۆشیان لێ بپارێزە نەوەك فریوت دەن و، لە هەندێك لەو فەرمانەی خوا بۆی ناردوویە خوارێ، هەڵەت کەن، ئەگەر هەر ڕووشیان وەرگێڕا، ئەوە بزانە کە خوا دەیەوێ لەبەر هەندێك لە گوناحەکانیان تۆڵەیان لێبکاتەوەو، هەڵبەت زۆربەی خەڵکیش لەڕێ لایانداوە. جا ئایا داوای فەرمانڕەوایی نەفامیی دەکەن؟ باشە، فەرمانڕەوایی کێ لە ئی خوا چاکترە بۆ کۆمەڵێك کە لە ئیمانیاندا هیچ گومانێکیان نیە.﴾المائدة:٤٩-٥٠.

بەڕاستی ئەوانەی دەیانەوێ بیروباوەڕی ئیسلام و ڕژێم و دەستووری ئیسلام لێك دابڕن، پێ بزانن یان نەزانن، دوژمنی ئیسلامن، چونکە ڕژێم و دەستووری ئیسلام، زۆر لە دینەمۆ(مولدة)ی کارەبا دەچێت و، بیروباوەڕی ئیسلامیش ئەو ڕووناکی‌یەیە، ئامێرەکە ئیش بۆ هێنانە بەرهەمی دەکات، جا ئەگەر ئامێرەکە پەکی بکەوێت، ڕووناکی‌یەکە نامێنێ و، ئیسلام کۆتایی دێت.

هەڵبەت ئایینی ئیسلام، بەوە جیا دەکرێتەوە کە توانیویەتی هەموو ڕەگەز و ڕەنگ و نەتەوەکان، یەکانگیر بکات و، بەیەك ئاڕاستە ڕێ و شوێن بۆ هەموویان دانێت و، هەمووان بکاتە هاو ڕێباز و هاو ئامانج و، ئەوەشی هەر بۆیە پێ کراوە، چونکە هەم بیروباوەڕە، هەم ڕژێم و دەستوور.

ڕاستە ئیسلام چەند بیروباوەڕێکی دیاری‌کراوی بۆ هێناوین، بەڵام ئەو بیروباوەڕانەی بە ڕووتی بۆ نەهێناوین، بەڵکو ئەو ڕژێم و دەستوورەشی لەگەڵ هێناون، کە لەسەری بنیات دەنرێن و پێی دەژین و، لەسەری پێویست کردووین شوێنکەوتوو و پابەندی بین، ئەویش ڕژێمێکی وردی پەروەردە و ئاڕاستە کردنە، کە-وەکو پێشتر باسمان کرد- هەموو شتێك دەگرێتەوە و، باسی هەموو حاڵەتێکی مرۆڤ دەکات و، تاك، قۆناغ قۆناغ پێبەهەڵادەبات، تا

سەرەنجام دەیگەیەنێتە قۆناغی دەست هەڵگرتن لە خۆپەرستی و ئارەزووی خۆبازیی و، دەیباتە قۆناغی یەکلابوونەوە بۆ خزمەتی مەبدەئەکانی قورئان و تێدا توانەوەیان.

بەم جۆرە ئیسلام، هەموو مسوڵمانان بە یەك شێوە پەروەردە دەکات و، یەك ڕێ و شوێنیان بۆ دادەنێت و، بۆ خزمەتی یەك جۆرە ئامانج ساغیان دەکاتەوە، وایان لێ دەکات، داخوازیی یەکێکیان، داخوازیی ئەوەی دیکەشیان بێت و، ئەوەی کۆمەڵێکیان ئیشی بۆ دەکەن و، ئەوەی بچووکیان بە تەمایەتی، گەورەشیان بە تەمای بێت و، ئەوەی زیان بە بە یەکێکیان دەگەیەنێت، زیان بە هەموانیان بگەیەنێت، چونکە هەموویان سەرباری جیاوازیی تاکەکانیان و لێك دووری وڵاتەکانیان، یەك گیان و یەك دڵ و یەك کەسن و، لەسەر ئەو بنەمایەشە، پێغەمبەر ﷺ مسوڵمانانی بە یەك لەش چواندووە، کە ئەگەر ئەندامێکی بێتە ئێش، هەموو ئەندامەکانی دیکەی تووشی ئازار و ئێش و شەونخوونیی دەبن.

جا ئەگەر ئیسلام لە ڕاستیدا بیروباوەڕ و ڕژێم و دەستوور بێت، ئەوە سروشتەکەی وا دەخوازێ حوکم و فەرمانڕواییش بێت، چونکە بنیاتنانی بیروباوەڕ وا پێویست دەکات ڕژێمێکیش بۆ خزمەت کردنی بنیات بنرێت و، ڕژێمی ئیسلام ناکرێ بنیات بنرێت لە ژێر سێبەری حوکمێکی ئیسلامیدا نەبێت، کە لەگەڵ ڕژێمی ئیسلامدا بێتەوە و، پشتی بگرێت، چونکە هەموو حوکمێکی غەیرە ئیسلامی، حەتمەن سەردەکێشێ بۆ پەك خستنی ڕژێمی ئیسلام و، ئەگەر درووست بوونی ڕژێمی ئیسلام پێویستی بە درووست بوونی حوکمێکی ئیسلامی هەبێت، ئەوە مەعنای ئەوەیە کە حوکمی ئیسلامی لە پێداویستییەکانی ئیسلامە، یان لە سروشتی ئیسلامە.

# ئیسلام دین و دەوڵەتە

ئیسلام هەر دین نییە بە تەنێ، بەڵکو دین و دەوڵەتە و، سروشتی ئیسلام وایە کە دەوڵەتی هەبێت و، ئەگەر ئەو دەقە ڕاشکاوانەی پێشووش کە باسمان کردن، لاپەڕین، ئەوانەی حوکم کردن بە گوێرەی ئەوەی خوا ناردوویەتی، واجب دەکەن، هیچ لە سروشتی ئیسلام، کە دروست کردنی حوکمی ئیسلامی و دەوڵەتی ئیسلامی پێویست دەکەن، ناگۆڕێت، چونکە ئەنجامدانی وەکو پێویستە، مسۆگەر نییە، مەگەر لە بن سێبەری حوکمێکی ئیسلامی خالیس و دەوڵەتێکی ئیسلامیدا کە بە گوێرەی فەرمانی خوا پێکهاتبێ. بەرپاکردنی ئیسلامیش بۆ خۆی، لەو چوارچێوەدا کە خوا دیاریی کردووە و، پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، پێویستی بە بنیاتنانی دەوڵەتیکی ئیسلامیی هەیە، کە ئیسلام بە پێی ئەو نەخشەی خوا بۆی دیاریی کردووە، بەرپا بکات، ئەمەش مەنتیقێکە، تەنها بابای خۆ بە زۆر زان ئینکاری دەکات، چونکە ناکرێ ئیسلام بە ڕاستی بەرپا بکرێت، لەژێر سێبەری دەوڵەتێکی نائیسلامیدا، کە بەرپاکردنی ئیسلامی بەلاوە گرنگ نییە و، زیانی لێ ناکەوێت ئەگەر شتی لێ کەم کات و، بە کەیفی خۆی پەکی بخات یان بە لاڕێیدا بەرێت و، ئیسلامی بەڕاستی، تەنها لە سایەی دەوڵەتێکدا دێتە دیی، کە لەسەر بنەماکانی ئیسلام بنیات نرابێت و، پابەندی ڕێ و شوێنەکانی بێت.

زۆربەی ئەو شتانەش کە ئیسلام هێناونی، جێبەجێ کردنیان بە تاکەکانەوە بەند نییە، بەڵکو بە دەوڵەتەکانەوە بەندە و، ئەمەش بە تەنێ ئەوە دەسەلمێنێ کە حوکم و فەرمانڕەوایی، لە سروشتی ئیسلام و پێداویستییەکانیەتی و، ئیسلام دین و دەوڵەتە.

ئیسلام زۆر كاری قەدەغە كردوون و، كردنیانی بە تاوان داناوە، كە مرۆڤیان لەسەر سزا دەدرێت و، چەند سزایەكی بۆ ئەو تاوانانە و، سزاكەی تۆڵە (كوشتنەوە)یە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان، لەمەڕ ئەوانەی كوژراون، تۆڵەمان بۆ بڕیارداون.﴾البقرة:١٧٨ و، یەكی دیكەیان دزی‌یە و سزاكەی دەست بڕینە: ﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا: پیاو و ئافرەتی دز، دەستیان ببڕن.﴾المائدة:٣٨.. هەروا بوختان كە سزاكەی دارلێدانە: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً: ئەو كەسانەی بوختانێ بۆ ژنانی داوێن پاك دەكەن و، چوار شایەتیش نامێنن، هەشتا شێلاقیان لێ بدەن.﴾النور:٤.. قسەشی لەسەر نییە كە قەدەغەكردنی چەند كارێك و، بە تاوان لە قەڵەم دانیان و، سزا لەسەر دانانیان، بابەتی حوكم و فەرمانڕەوایی یە و، لە ئیشە هەرە تایبەتی یەكانی دەوڵەتە، جا ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەت نەبا، ئەو ڕێگایەی نەدەگرتەبەر.

گومانیشی تێدا نییە كە قورئان بێ هوودە و لە خۆڕا ئەو دەقانەی باسی تاوان دەكەن، نەهێناون، بەڵكو بۆ ئەنجامدان و جێبەجێ كردن هێناونی و، ئەگەر قورئان جێبەجێ كردن و ئەنجامدانی ئەو دەقانەی لەسەر مسوڵمانان فەرز كردبێت، هەڵبەت دروست كردنی حكوومەت و دەوڵەتێكیشی لەسەر فەرز كردوون كە مشووری جێبەجێ كردنی ئەو دەقانە بخوات و، جێبەجێ كردنیان بە بەشێك لە ئەركی سەرشانی خۆی بزانێت.

هەروا ئیسلام یەكسانیی لە نێو خەڵكیدا واجب كردووە : ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ: ئەی خەڵكینە، هەڵبەت ئێوەمان لە نێر و مێیەك وەدیی هێناوەو، كردوومانن بە چەند گەلێك و چەند هۆزێك هەتا یەكدی بناسن، بەڕێزترینتان لای خودا، پارێزكارترینتانە.﴾الحجرات:١٣.. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ : ﴿النَّاسُ سَوَاسِيَةٌ

كَأَسنانِ المشطِ، لاَ فَضلَ لِعَرَبيٍّ عَلَى أَعجَمِيٍ إلاَّ بِالتَقوَى: خەڵك هەموو وەکو ددانەکانی شانە یەکسانن و، عەرەب لە غەیرە عەرەب چاکتر نییە بە تەقوا نەبێ)).. هەڵبەت یەکسان تەماشاکردنی خەڵکیش، کاری حکوومەتانە، نەك تاکان.

هەروا قورئان دادپەروەریی لە حوکم کردندا، بە واجب دادەنێت : ﴿وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ: هەرکاتێکیش بە کاروباری خەڵکی ڕادەگەن، بێ لاگری و بەدادپەروەری پێی ڕابگەن.﴾النساء:٥٨، دادپەروەریش لە حوکم کردندا، لە کاروبارە هەرە تایبەتی‌یەکانی حکوومەت و دەوڵەتانە.

وە ئیسلام لەسەر زاری پێغەمبەر ﷺ، وەپاش خۆدان(الاحتكار)ی حەرام کردووە: ﴿لاَ يَحتَكِرُ إلاَّ خَاطِيء: تەنها بابای هەڵە شت وەپاش خۆ دەدات)) و، سوود(ربا)ی بەم ئایەتە حەرام کردووە : ﴿وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا: خواش کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو سوود(ریبا)ی حەرام کردوە.﴾البقرة:٢٧٥ و، خراپ بەکارهێنانی دەست ڕۆیشتوویی و بەرتیلی حەرام کردووە و، خوا دەفەرموێ : ﴿وَلاَ تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالاَثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ: ماڵی یەکدی لەنێو خۆتاندا بەناڕەوا مەخۆن و، مەشی دەنە کاربەدەستان تا ڕێتان هەبێ بە ناڕەوا هەندێك لەماڵی خەڵکی بخۆن لەکاتێکدا ئەوەش دەزانن.﴾البقرة:١٨٨، حەرام کردنی وەپاش خۆدان و سوود و خراپ بەکارهێنان و بەرتیلیش، لە کارە هەرە لەپێش و تایبەتی یەکانی حکوومەتانی چاکەکارن.

هەروا ئیسلام باجی لەسەر ماڵ و سامان داناوە: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا: لە دارایی‌یەکی هەیانە، سەدەقەیان لێ وەرگرە، تا بەوە پاك و خاوێنیان بکەیەوە.﴾التوبة:١٠٣ و، لە پارە و سامانی دەوڵەمەنداندا، هەندێك ماف بۆ هەژاران فەرز کردووە : ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ(٢٤) لِلسَّائِلِ

وَالْمَحْرُومِ: ئەوانەشی لە دارایییەکەیاندا بەشێکی ئاشکرا هەیە بۆ سوالْکەر و بێبەش.﴾المعارج:٢٤-٢٥ و، جۆرەها باجی لەسەر سامان داناوە، لە پێناوی خوا و بۆ دەست کورت و نەداران خەرج بکرێت، هەروەکو لە بەشی (سامان)دا باسمان کرد و، ئەو کەسانەی سامانیان لە دەستدایە، بە چەندەها یاسا و مەرجی پابەند کردوون.. ئەو شتانەش هەموویان، تایبەتیترین کاری حکوومەتانن، هەر لە سەردەمە هەرە کۆنەکانەوە تا ئێستا و، تەنانەت لە گرنگترین ئەو شتانەن حکوومەتان دروست دەکەن و دەڕووخێنن.

هەروا ئیسلام واجبی کردووە حوکم و فەرمانڕەوایی بە ڕاوێژ بێت، وەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ: کاروبارییان لەنێوخۆدا بە پرس و ڕایە﴾شوری:٣٨ و، ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ: لە کاروباردا پرس و ڕایان پێ بکە﴾ال عمران:١٥٩.. بەجێهێنانی ڕاوێژیش، پێویستی بە حوکمێکی ئیسلامی و دەوڵەتێکی ئیسلامی هەیە و، ئەگەر ئیسلام دین و دەوڵەت نەبایە، باسی شێوازی حوکم کردن و جۆری حکوومەتی نەدەکرد.

بێجگە لەوانەش، لە ئیسلامدا دەقێکی ئەوەندە زۆر هەن ژماردنیان گرانە، کە باسی پێوەندیی تاک بە دەوڵەتەوە و، دەوڵەت بە تاکەوە دەکەن و، ڕەفتار و کاروباری وەکو کڕین و فرۆشتن و، کرێ و بەخشین و، وەسیەت و هاوسەرگەریی و تەلاق و شتی دی ڕێك دەخەن و، بەڕێوەبردن و ئابووریی ڕێك دەخەن و، کێشە و ناکۆکییە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان و، ئاشتی و شەڕ و ڕێککەوتن و پەیماننامە هەڵدەبڕن و، چارەسەری هەموو کاروبارێکی تاك و کۆمەڵ دەکەن و، لەسەر بناغەی یەکسانی و یارمەتی و هاوکاریی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵ بنیات دەنێن و، ئەو دەقانەش هەموو پێکەوە دەبنە دەستوورێك بۆ فەرمانڕەوایی، کە هەموو دەستوورێکی دانراوی مرۆڤکرد وەلا دەنێت و، دەبێتە یاسایەك بۆ هەموو هەڵس و کەوتێکی مرۆڤ، کە تا ئێستا یاسا و بەرنامەی وا

بەرز و بالاّ نەبووە، هەموو ئەو شتانەش، تەنها حکوومەت و دەوڵەتان ئەنجامیان دەدەن و سەریان لێ دەردەچن، جا مادام ئیسلام هێناونی و فەرزی کردوون، کەوابوو: حکوومەتی هێناوەو، دروست کردنی دەوڵەتی فەرز کردووە و، لە ئیسلامدا دین و دەوڵەت هەر یەکە.

جا ئیسلام هەموو کاروبارێکی دنیا، لەسەر بنچینەی دین بنیات دەنێت و، دین دەکاتە پشتیوانی دەوڵەت و، دەستەواژەیەک بۆ ڕێك و پێك کردنی حوکمڕانی و، ڕێ و شوێن بۆ دانانی فەرمانڕەوایان و، ئەوانەی لەبەردەستیاندان.

دەوڵەتی نموونەییش لە ئیسلامدا، ئەو دەوڵەتەیە کاروباری دنیا بە گوێرەی دین بنیات دەنێت و، بە پێی فەرمانی خوا ڕەفتار لەگەڵ خەڵکی بەردەستیدا دەکات و، لەو شتانەی خوا فەرمانی نەکردنیانی پێ کردوون، پشتگیرییان لێ دەکات : ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ: ئەوانەی ئەگەر لەم زەمینە دایانمەزرێنین، نوێژکەر و زەکاتدەرن و، فەرمان بەچاکە دەکەن و، پێش لەکاری خراپە دەگرن.﴾الحج: ٤١.

دینیش لە ئیسلامدا بۆ دەوڵەت پێویستە و، هەروا دەوڵەتیش لە شتە پێویستەکانی دینە، چونکە دین بەبێ دەوڵەت ئەنجام نادرێت و، دەوڵەتیش بەبێ دین وەك پێویست نابێت..

# حکومەتی ئیسلامی
# ئەرک و جیاکەرەوەکانی

- ئەو حکومەتەی فەرمانی خواجێبەجێ دەکات
- مەنتیقی ئەزموونان
- ئەرکی حکومەت جێبەجێکردنی فەرمانی خوایە
- جیاکەرەوەکانی حکومەتی ئیسلامی
- جۆری حکومەتی ئیسلامی

# ئەو حکومەتەی فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات

ئەگەر خوای گەورە لەسەری واجب کردبین حوکم بەوەی بۆ پێغەمبەری ناردووە، بکەین و، لە نێو خۆماندا بیکەینە داوەر، ئەوە لەسەر مسوڵمانانی واجب کردووە، حکوومەتێك لەسەر خۆیان بکەنە فەرمانڕەوا، فەرمانی خوایان لە نێودا جێبەجێ بکات و، پارێزگاریی لێ بکات و، ئەندامەکانی، وەکو چۆن بە ڕۆژووگرتن و نوێژ کردن خواپەرستی دەکەن، بە بنیاتنانی حوکم و فەرمانڕەواییش بە گوێرەی بەرنامەی خوا، خوا پەرستی بکەن.

لە بنەڕەتیشدا حکوومەت پێویستی یەکی کۆمەڵایەتی یە، نەبوونی ناکرێ، جا ئەگەر فەرمانڕەوایی و حوکم چەند خەسڵەتێکی دیاری کراوی هەبن، ئەوە پێویستە ئەو حکوومەتەی فەرمانڕەوایی یەکەشی بە دەستە، خاوەنی هەمان ئەو خەسڵەتانە بێت لە پێناوی سەرکەوتنی حوکمەکەدا، چونکە بابایەك بۆ خۆی شتێکی نەبێت، ناتوانێت بیبەخشێت و، تەنها ئەو کەسەش بیروباوەڕێك دەکاتە کردەوە، کە باوەڕی پێ هەبێت.

لەبەر ئەوە جا ئەگەر واجب بێت فەرمانڕەوایی بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام بێت، ئەوە واجبیشە حکوومەت ئیسلامیی بێت و، هەموو ئەندامەکانی باوەڕیان بەو بنەمایانە هەبێت فەرمانڕەوایی یەکەی لەسەر بنیات نراوە و، جەخت لەسەر کار پێکردن و ئەنجامدانی بکەن.

ئەگەر پێویستیش بوو حوکم سۆشیالیستی بێت، ئەوە گەمژەیی‌یە ئەو حکوومەتە بدرێتە دەستی ئەو کەسانەی باوەڕیان بە سۆشیالیزم نییە.

ئەوە مەنتیقی خەڵکە و، ئەوە سروشتی شتانە، جا هەر کەسێك بیەوێت ئیسلام بە حکوومەتێك کە حوکم بە شەریعەتی ئیسلام ناکات، جێبەجێ بکات، ئەوە کار بۆ ڕووخاندن و تێکدانی ئیسلام دەکات.

## مەنتیقی ئەزموونان

بەراستی ئەزموونەکانی وڵاتانی مسوڵمان نشین، سەلماندوویانە کە ئیسلام تەنها بەوەندە جێبەجێ ناکرێت کە کاربەدەستەکان مسوڵمان بن، بەڵکو دەبێ حوکم بە ئیسلام بکەن و، قورئان بۆ فەرمانڕەوا و مسکێنان بکەنە دەستوور و یاسا، ئەوەش سەرجەم دەوڵەتانی مسوڵمان نشین، تێیان فکرە، یەکیان نییە حوکم بە ئیسلام بکات و، لە هەموو ئیش و کارەکانیدا پێڕەویی لێ بکات، هەرچەندە کاربەدەستەکان و زۆربەی خەڵکەکەیان مسوڵمانن. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو ئەزموون و تاقیکردنەوەکان سەلماندوویانە کە ئەو کار بەدەست و فەرمانڕەوا مسوڵمانانەی شارەزای ئیسلام نین و، هەوڵی جێبەجێ کردنی حوکمەکانی نادەن، کۆن و تازە هەر شەڕیان بە ئیسلام فرۆشتووە و، ئامێرێکی ڕام و دەستەمۆ بوون لە دەستی ئەو دوژمنانەی خوادا کە پیلان لە ئیسلام و مسوڵمانان دەگێڕن و، لە سەردەمی ئەو فەرمانڕەوا نەفامانەدا، قەدەغەکانی ئیسلام حەڵاڵ کران و، هەرچی خوا حەڵاڵی کردووە حەرام کرا و، هەرچی خوا حەرامی کردووە حەڵاڵ کرا و، فەساد و خراپە لە کۆمەڵی ئیسلامیدا بڵاوبۆوە و بەرەڵایی پەرەی گرت و، بڵاوبوونەوەی ئیسلام ڕاوەستا و، دەسەڵاتی نەما و، بەبێ ئەوەی توانای بەرگریی لە خۆ کردنی هەبێ، ئەوانەی جاران هیچ نەبوون، دەستیان بەسەر مسوڵمانان و وڵاتانی ئیسلامدا گرت..

ئەوەیە مەنتیقی مرۆڤ و مەنتیقی واقیع و مەنتیقی ئەزموونان، جا ئەوە هەمووی دەیسەلمێنێ کە دروست کردنی حوکمی ئیسلامی، بەوجۆرە دەبێت کە حکوومەتان دەبێ لەو کەسانە پێك بێن کە باوەڕیان بە یاسای ئیسلامەتی هەیە و، هەموو خەم و خەیاڵیان جێبەجێ کردنی ئیسلام و چەسپاندنی بنەماکانیەتی و، لەمەودوا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو مەنتیقە، مەنتیقی قورئانیشە.

## ئەرکی حکومەت جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوایە

هەڵبەت ئیسلام، جێبەجێ کردنی ئیسلامی بە ئەرکی حکوومەتی ئیسلامیی داناوە، چونکە قورئان لەسەر حکوومەتی ئیسلامی فەرز کردووە هاوبەش پەرستی(شرك) لەنێو بەرێت و، ئیسلام بکاتە فەرمانڕەوا و، نوێژ بەرپابکات و زەکات وەربگرێت و، فەرمان بە چاکە و پێشگریی لە خراپە بکات و، کاروباری خەڵکی بە گوێرەی بەرنامەی خوا بەڕێوە بەرێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ: خوا ئەوانەتان کە باوەڕیان هێناوەو کاری چاك دەکەن، لەسەر زەویی دەیانکاتە جێنشین، هەروەکو چۆن ئەوانەی پێش ئەوانی کردنە جێنشین، دینەکەشیان کە خۆی بۆی پەسند کردوون، هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی، تا تەنها من بپەرستن و هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن و، هەر کەسێکیش لەدوای ئەوە سپڵەیی بکات، ئەوە لە ڕیزی لاڕێ

بووانە.﴾النور:٥٥، هەروا دەفەرموێ : ﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنْ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الأُمُورِ: ئەوانەی هەرکاتێك لەسەر زەویی دامانمەزراندن، نوێژ دەکەن و فەرمان بەچاکە دەکەن و، ڕێ لە خراپە دەگرن و، سەرەنجامی هەموو ئیش و کاران هەر بۆ خوایە.﴾الحج:٤١.

فەرمان کردن بە چاکەش، هەڵنانی خەڵکە بۆ هەر شتێك کە بە گوێرەی ئیسلام دەبێ بگوترێ، یان بکرێ و، پێشگری کردن لە خراپەش، هاندانی خەڵکە بۆ نەکردنی هەر شتێکی دەبێ نەکرێت، یان گۆڕینی هەر شتێکی بە پێی ڕێ و شوێن بۆ دانانی ئیسلام، دەبێ بگۆڕرێت، جا ئەگەر حکوومەت فەرمان کردن بە چاکە و پێشگریی کردن لە خراپەی بەجێ هێنا، ئەوە هەرچی ئیسلام فەرمانی پێ کردووە ئەنجامی داوە و، هەرچی پێچەوانەی ئیسلامە، تێکی داوە.

جا قورئان لەسەری واجب کردووین گوێڕایەڵیی کاربەدەست و حکوومەت بکەین، بە مەرجێك ئەوانیش ئەگەر لە شتێکدا تێك گیران، بەرنامەی خوا بکەنە داوەر و، حوکم بەوە بکەن کە خوا ناردوویەتی : ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ[1] مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ: ئەی گەلی بڕواداریینە، بەقسەی خوا و پێغەمبەر و کاربەدەستانی خۆتان بکەن، هەر کاتێکیش لەنێو خۆتاندا لەسەر شتێك پێك نەهاتن، حەواڵەی خوا و پێغەمبەری بکەن.﴾النساء:٥٩.

هەڵبەت گێڕانەوەی بابەتی ناکۆکیی لە سەریش بۆ حوکم و بەرنامەی خوا، پێویستی بەوەیە حکوومەت و کاربەدەستان، فەرمانی خوا بە جێ بێنن و، بە گوێرەی بەرنامەی خوا و پێغەمبەر حوکم بکەن.. دانی ماڤ تێك گیران لەگەڵ

[1] هەندێك کەس ((أولي الأمر﴾ بە کاربەدەستان لێك دەدەنەوە و، هەندێکی دیکەش بە ئەهلی پرس و ڕاوێژ.

كاربەدەستانیش بە بەردەستان و، بردنەوەی بابەتی لەسەری تێك گیراون بۆ فەرمانی خوا بۆ هەڵبڕینی، وا دەخوازێت كاربەدەستان پابەندی فەرمانی خوا بن و، لەبەرنامەی خوا لانەدەن.

ئەگەر حكوومەتانیش لەسەر گوێڕایەڵیی بەردەستانیان ڕادەوەستن و، لە بنەماكانی ئیسلام ئەوەیە كە مسكێن و بەردەستان بە قسەی فەرمانڕەوایانی مسوڵمان بكەن، كە كاروباریان بۆ هەڵدەسووڕێنن، دیسان ئەوەش هەر لە بنەماكانی ئیسلامە كە هەر كاتێك كاربەدەست و فەرمانڕەوایان لە جوغزی فەرمان و بەرنامەی خوا چوونە دەرێ، خەڵك دەبێ لێیان یاخی بن و بە قسەیان نەكەن، وەكو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((لاَ طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ: نابێ لە سەرپێچی كردنی خوادا، بە قسەی كەس بكرێت)).

بەو جۆرە ئیسلام، گوێڕایەڵیی كردنی كاربەدەستانی لە لایەن بەردەستانەوە، بە گوێڕایەڵیی كردنی خوا لە لایەن كاربەدەستانەوە بەستووە، جا حكوومەتی ئیسلامیی پێویستە لەسەر ئەنجامدانی فەرمانی خوا بنیات بنرێت و، بە هیچ جۆرێك بۆی نییە لە بەرنامەی خوا لادات، دەنا مافی ئەوەی نامێنێ خەڵك بە قسەی بكات و، سەرەنجام مافی حوكمڕانی و فەرمانڕەوایی لە دەست دەدات.

جا ئەگەر مافی حكوومەت لەوەدا كە خەڵك بە قسەی بكات و هەروا لە حوكمڕانیدا، لە كاتی ئەنجامدانی فەرمان و بەرنامەی خوادا چەسپاو و جێگیر بێت، ئەوە لەسەری واجبە فەرمانی خوا بەجێ بێنێت و ئیش بە قوڕئان بكات.

# جیاکەرەوەکانی حکومەتی ئیسلامی

حکوومەتی ئیسلامیی، لە هەموو ئەو حکوومەتانەی ئەمڕۆ لە دنیادا هەن و، ئەوانەش کە پێشتر هەبوون، جیایە، چونکە حکوومەتێکی تاقە و، وەکو هیچ حکوومەتێکی دیکە نییە.

حکوومەتی ئیسلامیی سێ خەسڵەتی تێدان، کە لە هیچ حکوومەتێکی تردا نین، کە ئەمانەن :

یەکەم- حکوومەتێکی قورئانی یە.

دووەم- حکوومەتی ڕاوێژ و پرس و ڕایە،

سێیەم- حکوومەتی جێنشینی(خلافة) یان پێشەوایی(إمامة)ە.

**یەکەم خەسڵەت : حکوومەتێکی قورئانییە.**

حکوومەتی ئیسلامی بەوە جیا دەکرێتەوە کە حکوومەتێکی قورئانی یە، واتە : مل کەچی قورئانە، کە ئەو کتێبەیە خوا بۆ محمدی پێغەمبەری ﷺ ناردووەتە خوار.

قورئانیش دەستووری باڵای حکوومەتی ئیسلامی یە، ڕێ و شوێن بۆ ڕەفتاری دادەنێت و، ماف و ئەرکەکانی بە شێوەیەکی گشتی دیاریی دەکات و، ئەو سنوور و ڕێڕەوانە، بواری هەڵسووڕانی پێ دەدات..

هەروا قورئان لە هەمان کاتدا ماف و ئەرکەکانی تاکەکان و ڕاددەی دەستەڵاتی دەوڵەت بەسەریانەوە و، چەندێتیی مل کەچ بوونیان بۆ دەستەڵاتی دەوڵەت، دیاریی دەکات..

هەڵبەت قورئانیش چەندان جیاکەرەوەی هەن، کە لە هەموو دەستوورێکی دیکەی کە ئێستا مرۆڤ ناسیویەتی، هەڵداوێری، گرنگترین ئەو جیاکەرەوانەش ئەمانەن :

١- قسەی خوایە کە بە سرووش (وحی) بۆ پێغەمبەری نەخوێندەواری خۆی محمدی ناردووە، تا بە خەڵکی ڕابگەیەنێت و، بەو ڕووناکی یە خەڵك لە تاریکستان دەربێنێت و، ڕێنوێنی یان بکات و لە گومڕایی بیانپارێزێت : ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ(٥١) وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ(٥٢) صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ أَلاَ إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأُمُورُ: هەرگیز خودا هیچ کەسێکی ڕوبەڕوو نەدواندوە، یان فەرمانی لە ڕێی دڵیەوە ناردووە بە وەحی، یان لە پشت پەردەوە بووە، یان قاسیدێکی ناردووە و ئیزنی داوە سروشی بۆ بنێرێ، بەڕاستی ئەو بەرزی کارزانە.. هەر بەم جۆرەش ئێمە لە فەرمانی خۆمان گیانێکمان بۆ ناردی، لەپێشدا نەتدەزانی کتێب چییە، نە ئیمان، بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە مەشخەڵێك، کە ئەو عەبدانەی بمانەوێ بەوە ڕێنوێنیی دەکەین و تۆش لە ڕاستەڕێ ڕێبەری ، ڕێگە بەرەو ئەو خوایەی هەرچی کارێك هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە..﴾الشورى:٥١-٥٣، ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا: بەم جۆرە قورئانێکی عەرەبیمان بۆ ناردی.﴾الشورى:٧. ﴿وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ: ئەم قورئانەم بۆ نێرراوە تا ترستان پێ وەبەرنێم، هەروا ئەوانەش کە ئەم قورئانەیان پێ دەگات.﴾الأنعام:١٩.

٢- مسوڵمانان لەسەریانە شوێن قورئان کەون و دەستی پێوەبگرن و، بە هیچ جۆرێك بۆیان نییە لێی لادەن : ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّى يَحْكُمَ اللَّهُ

وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ: بکەوە دوای ئەوەی خوا بۆت دەنێرێ و ئارام بگرە، هەتا خودا پێڕاتدەگات و خودا باشترین دادوەرە.﴾یونس:١٠٩. ﴿وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا: بکەوە شوێن ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت دێت، هەڵبەت خوا ئاگای لە کردەوەکانتانە.﴾الأحزاب:٢. ﴿فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ: دەست بەو پەیامەوە بگرە بۆت هاتۆتە خوار، هەڵبەت تۆ لەسەر ڕێبازێکی راستی.﴾الزخرف:٤٣. ﴿اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ: بکەونە دوای ئەوەی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووەو، بێجگە لەوی مەکەونە دوای سەرپەرستانی دیکە﴾الأعراف:٣. ﴿اتَّبِعْ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ: بکەوە شوێن ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە، بێجگە لەوی چ پەرستراوی ڕەوا نین و، خۆ لە هاوبەش پەرستان لادە.﴾الأنعام:١٠٦.

٣- بێگومان قورئان نە گۆڕین هەڵدەگرێت، نە دەستکاریی، چونکە لە لایەن خواوە هاتووە و، قسە و وشەکانی خواش بە کەس ناگۆڕێن : ﴿قَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا ائْتِ بِقُرْآنٍ غَيْرِ هَذَا أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أُبَدِّلَهُ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِي إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ: ئەوکەسانەی بە تەمای دیداری ئێمە نین، گوتیان: یان قورئانێکی دیکە بێنە، یان بیگۆڕە، بڵێ: بۆم نیە لە خۆڕا بیگۆڕم، من تەنها دەکەومە دوای ئەوەی لە خواوە بۆم دێت.﴾یونس:١٥. ﴿وَاتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ كِتَابِ رَبِّكَ لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَلَنْ تَجِدَ مِنْ دُونِهِ مُلْتَحَدًا: ئەوەی بۆت هاتوە لە کتێبی پەروەردگارت، بخوێنەوە، ناشێ کەس وتاری خودا بگۆڕێ و، بێجگە لەوی فریاگوزارێك نادۆزیەوە.﴾الکهف:٢٧. ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلاً لاَ مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ: قسەکانی پەروەردگارت لە ڕاستی و دادپەروەریدا، تەواو و بێکەم و کورتین، کەس ناتوانێ بیانگۆڕێ و، زۆر بیسەر و هەرە زاناش هەر ئەوە.﴾الأنعام:١٥. ﴿لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ: وشەکانی خوا ناگۆڕێن﴾یونس:٦٤.

٤- هەڵبەت قورئان زیاد کردن و کەم کردن هەڵناگرێت، چونکە بە کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ و بڕانی سروش(وحی)، تەواو بووە، یان کەمێك پێش کۆچی دوایی ئەو زاتە تەواو بووە، ئەو ڕۆژەی خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا: وا لەمڕۆوە دینەکەتانم تەواو کرد و، بەبێ کەم و کورتی چاکەم دەگەڵ ئێوەدا کرد و، ئیسلامیشم کردە دینی ئێوە.﴾المائدة:٣.

٥- قورئان هەڵوەشاندنەوە هەڵناگرێت، لەبەر ئەو هۆیانەی پێشتر باسمان کردن و، لەبەر ئەوەی خوای باڵا دەست، بە پەیامی محمد ﷺ کۆتایی بە پەیامان هێنا و، ئەوی کردۆتە دوا پێغەمبەر : ﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ: محمد بابی هیچ کام لە پیاوانی ئێوە نییە، بەڵام ڕاسپاردەی خوایە و ئاخیری پێغەمبەرانەو، خواش هەموو شتێك دەزانێ.﴾الأحزاب:٤٠.. چونکە مرۆڤیش-کە جێنشینی سەر زەوییە- بۆی نییە لە فەرمانی ئەو خوایەی کردوویەتە جێنشین، دەرچێت و، ناتوانێ قسەی وی هەڵوەشێنێتەوە، یان پەکی ئیش پێ کردنی بخات، جا ئەگەر وا بکات، ئەوە بە هۆی دەرچوونی لە سنووری ئەرك و کاری خۆی و، دەست تێ وەردانی بابەتێك کە ئیشی وی نییە، کارەکەی بە تەواویی پووچ و بێ هوودەیە.

دەتوانین لە ڕوویەکی دیکەشەوە بیسەلمێنین کە قورئان قابیلی هەڵوەشانەوە نییە، ئەویش ئەوەیە کە یاسای بنەڕەتیی لە شەریعەتی ئیسلام و قانوونە مرۆڤکردەکانیشدا، ئەوەیە کە هیچ دەقێك، بە دەقێکی لە خۆی بەهێزتر یان وەك خۆی بەهێز نەبێ، هەڵناوەشێتەوە، واتە: ئەو دەقە دەبێ لە یاسادانەرەکە خۆیەوە دەرچوبێت، یان ئەو دەستەیەی-لانی کەم- دەستەڵاتی یاسادانانی هەیە، وەکو چۆن ئەو دەستەیەی ئەو دەقانەی هێناون کە دەیانەوێ هەڵیان وەشێنێتەوە، ئەو دەستەڵاتەی هەیە، لەبەر ئەوە ئەو دەقانەی قورئان

هەڵدەوەشێننەوە، دەبێ قورئانێك بێ خوا ناردبێتی و، تازە لە دوای پێغەمبەریش قورئان نایەتە خوارێ، چونکە وەحی کۆتایی هاتووە و، ناشکرێ بگوترێ ئەو دەقانەی لە دەستە و پێڕەکانی مرۆڤەوە، کە تایبەتن بە یاسادانان، دەردەچن، لە پلەی قورئاندان، یان لە دەستەڵاتی یاسادانانەکاندا، لە ئاستی خوا و پێغەمبەردان، لەبەر ئەوە قەت مرۆڤ لە دەستی نایەت قسەی خوا هەڵوەشێنێتەوە، یان پەکی کار پێ کردنی بخات.

**دووەم خەسڵەت : حکوومەتی ڕاوێژ و پرس و ڕایە.**

خوا ڕاوێژی بە یەکێك لە پێداویستی یەکانی باوەڕ داناوە و، کردوویەتە خەسڵەتێکی هەمیشەیی باوەڕداران، کە لە خەڵکی دیکەیان جیا دەکاتەوە: ﴿وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ: ئەو کەسانەش کە بە دەنگی پەروەردگاریانەوە چوون و نوێژ دەکەن و ئیش و کاریان لەنێوخۆدا بە ڕاوێژە و، لەو بژێوییەی پێمان بەخشیون، دەبەخشن.﴾الشوری:٣٨، جا ئیمانی مسوڵمانان کامڵ نابێت، بە هەبوونی خەسڵەتی ڕاوێژ نەبێت لە نێویاندا و، هیچ کۆمەڵێکی مسوڵمان نابێ کاروباری خۆی لەسەر غەیری ڕاوێژ بنیات بنێت، یان پێی قایل بێت، دەنا تاوانبارە و، سەرپێچی لە فەرمانی خوا کردووە.

خوای گەورەش فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە، لە ئیش و کاردا پرس بە برادەرانی بکات : ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ: لە کاروباردا پرس و ڕایان پێ بکە﴾آل عمران:١٥٩.. لەبەر ئەوەش نا کە پێغەمبەر ﷺ پێویستی بە تەکبیر و ڕای ئەوانە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ڕاوێژ کردن فەرزە و خوا لەسەری واجب کردوون و، لەسەر کار بەدەستی پێویست کردووە لە هەر شتێکدا پێوەندیی بە کۆمەڵەوە هەیە، ڕاوێژ بکات و، لەسەر کۆمەڵیشی فەرز کردووە لە هەموو ئیش و کارێکی خۆیدا ڕای خۆی دەربڕێت، جا کاربەدەست بۆی نییە لە کاروباری گشتیدا هەر

به قسه‌ی خۆی بکات و، کۆمه‌ڵ بۆی نییه له‌و شتانه‌دا که پێوه‌ندییان به به‌رژه‌وه‌ندیی کۆمه‌ڵه‌وه هه‌یه، بێده‌نگ بێت، ئه‌مه‌ش له‌گه‌ڵ ئه‌و فه‌رمانه‌ی قورئاندا که فه‌رمان کردن به چاکه و پشتگیریی کردن له خراپه‌ی فه‌رز کردووه: ﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ: با له‌ئێوه کۆمه‌ڵێك پێك بێت بانگه‌واز بکه‌ن بۆ کاری چاك و، فه‌رمان به چاکه بکه‌ن و ڕێ له خراپه بگرن.﴾آل عمران: ١٠٤، دێته‌وه.

به‌ڵام هه‌رچه‌نده ڕاوێژ فه‌رزیکه له فه‌رزه‌کانی ئیسلام، فه‌رزێکی ڕه‌ها نییه هه‌موو شتێك بگرێته‌وه، به‌ڵکو ته‌نها له‌و شتانه‌دا پێویسته که قورئان و سوونه‌ت یه‌کلایان نه‌کردوونه‌ته‌وه، به‌ڵام ئه‌و شتانه‌ی قورئان و سوننه‌ت یه‌کلایان کردوونه‌ته‌وه، ئه‌وه مه‌گه‌ر ڕاوێژه‌که له جوغزی جێبه‌جێ کردن و ڕێکخستنی ئه‌و شتانه‌دا بێت، ده‌قی قورئان باسی کردوون و سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ڕوونی کردوونه‌ته‌وه، ده‌نا ڕاوێژ نایانگرێته‌وه.

ڕاوێژیش له‌و شتانه‌دا که فه‌رزه، ڕه‌ها نییه و به هه‌ندێك شته‌وه به‌نده، نابێ له سنووری قورئان و سوننه‌ت ده‌رچێت، چونکه به هیچ جۆرێك نابێ ڕاوێژ ببێته هۆی دژایه‌تی کردنی ده‌قه‌کانی یاسادانانی ئیسلامیی، یان چوونه ده‌ره‌وه له گیانی یاسا و، پێویسته هه‌میشه ڕاوێژ له‌گه‌ڵ یاسای ئیسلامدا یه‌کانگیر بێت و، به گوێره‌ی ڕێ و شوێن و گیانی به‌رنامه‌ی خوا بێت.

پابه‌ندبوونیش به یاسا و ڕێ و شوێنی ئیسلامه‌وه، وا ده‌خوازێ که کاربه‌ده‌ستان و هه‌موو ئه‌هلی ڕاوێژ، یان زۆربه‌یان شاره‌زای یاسای ئیسلام بن و، له گیان و ڕێ و شوێنه‌کانی حاڵی بن و، ئه‌مه‌ش مه‌عنای ئه‌وه‌یه، ڕاوێژ هه‌ر به‌و که‌سانه بکرێت که چه‌ند خه‌سڵه‌تێکی تایبه‌تی یان تێدان.

**سێیەم خەسلەت: حکوومەتی جێنشینی( خلافة ) یان پێشەوایی( أمامة )ە.**

لە بەشی جێنشینیدا زانیمان کە خوا مرۆڤی لەسەر زەویی کردۆتە جێنشین و، جێنشینیش سێ جۆرە: جێنشینی گشتیی و، جێنشینیی دەوڵەتان و، جێنشینیی تاکەکان و، گوتیشمان جێنشینیی تاکان، جێنشینی یە لە سەرکردایەتیدا و، ئەو کەسەی کراوەتە جێنشین، جاری وایە ناوی دەنێن خەلیفە، هەروەکو ناو لە داود﷣ نرا : ﴿يَادَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ: ئەی داود، ئێمە تۆمان کردە جێنشینی سەر زەویی، جا بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا حوکم لەنێو خەڵکیدا بکە.﴾ص:٢٦، جاری واش هەیە بابای جێنشین ناودەنرێ پێشەوا(امام)، هەروەکو ئیبراهیم﷣ و هەندێك لە سەرکردەکانی بەنوئیسرائیل ناونران : ﴿وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ: ئەوسا خودا بە چەند وشەیەك ئەزموونی ئیبراهیمی کرد، پێکیهێنان، گوتی: دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دنیا، گوتی: ئەدی تۆرەمەکەم؟ گوتی: ناهەقیکاران وەبەر بەڵێنم ناکەون.﴾البقرة:١٢٤، ﴿وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا: کردیشمانن بە پێشەوا کە بە فەرمانی ئێمە ڕێنوێنیی خەڵك بکەن﴾الأنبياء:٧٣، لەوانەشە بابای جێنشین ناوی لێ بنرێت مەلیك (پاشا) : ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ يَاقَوْمِ اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنْبِيَاءَ وَجَعَلَكُمْ مُلُوكًا: ئەو دەمانەش کە موسا بە هۆزی خۆی گوت: نابێ ئێوە هەرگیز ئەو چاکەیە لەبیر کەن کە خوا دەربارەی کردوون، کە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لەنێو خۆتان بۆ ناردوون، چەندان پاشای لەخۆتان پەیدا کردووە.﴾المائدة:٢٠، ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا: پێغەمبەرەکەشیان پێی گوتن: هەڵبەت خوا تالووتی ناردووە پاشای ئێوە بێ﴾البقرة:٢٤٧.

مەبەستیش لە خەلافەت و ئیمامەتی و پاشایەتیش لە دەقەکانی قورئاندا، تەنها سەرۆکایەتی‌یە بە مەعنا گشتی‌یەکەی، نەك ڕژێمێکی تایبەتی‌ی حوکمڕانیی، چونکە داود لە قورئاندا، هەم بە خەلیفە ناوی هاتووە، هەم بە پاشا : ﴿يَادَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً: ئەی داود ئێمە کردمانن بە جێنشین﴾ص:٢٦، ﴿وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ: داودیش جالووتی کوشت و، (خوا) دەستەلات و پاشایەتیی دایە.﴾البقرة:٢٥١. ئیبراهیمیش لە شوێنێك ناونراوە پێشەوا و، قەولیشی پێ دراوە ئەو ڕۆڵە و نەوانەشی کە لە سەر ڕێڕوونیی خوا دەڕۆن، ببنە پێشەوا : ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ: گوتی: ئەمن دەتکەمە پێشەوای خەڵك، گوتی: ئەدی تۆرەمەکەم؟ گوتی: پەیمانی من ستەمکاران ناگرێتەوە﴾البقرة:١٢٤، بەلام لە جێیەکی دیکەدا ڕەچەڵەکەکەی بە پاشا ناو دەبات : ﴿فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُمْ مُلْكًا عَظِيمًا: خۆ دیاریشە ئێمە بە بەرەی ئیبراهیم کتێب و کارزانیمان داو، دەستەلاتێکی گەورەشمان پێ سپاردن.﴾النساء:٥٤.

قەولیشی بە بەنوئیسرائیل داوە کە لە پاش کۆیلەیی و چەوسانەوەیان بە دەستی فیرعەون، ببنە پێشەوا: ﴿وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ: بڕیارمان دا ئەوانەی لەم زەمینەدا زەبوون کران، بەچاکە وەیانخوێنین و بیانکەینە پێشەوا و میراتگرانی زەویی.﴾القصص:٥، جا کاتێك لە ستەمی فیرعەون قوتار بوون و، دەوڵەتێکی سەربەخۆیان بۆ خۆ پێکهێنا، مووسا دەستی پێ کرد، نیعمەتەکانی خوای وەبیر دەهێنانەوە و پێی گوتن : ﴿اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنْبِيَاءَ وَجَعَلَكُمْ مُلُوكًا: ئەو چاکەی خوا دەگەڵی کردوون، هەر لە بیرتان بێت، کە چەندان پێغەمبەری لەنێودا ناردون و، کردوونی بە پاشا.﴾المائدة:٢٠.

جا خەلافەت و پاشایەتی و پێشەوایەتی، هەموویان هاوواتان و، ئاماژە تەنها بۆ سەرۆکایەتی‌ی بالای دەوڵەت دەکەن نەك زیاتر.

تاکە ڕژێمی حوکمڕانی، کە ئیسلام دەیناسێت، ئەو حوکمەیە لەسەر دوو پایە ڕاوەستابێت: یەکیان: گوێڕایەڵیی فەرمانی خوا و، دوورکەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغەی کردوون و، دووەمیشیان: ڕاوێژە، واتە: کاروباری خەڵك لە نێو خۆیاندا بە ڕاوێژ و پرس و ڕا بێت، جا ئەگەر حوکمڕانی لەسەر ئەو دوو پایە بنیات نرا، ئەوە حوکمڕانییەکی ئیسلامیی خاڵیسە، جا چ ناوی خەلافەت بێت، چ پێشەوایەتی(امامة)، چ پاشایەتی و، هەموو ئەو ناوانە ڕاستن و، هیچیان تێدا نییە.

بەڵام ئەگەر حوکم لەسەر ئەو دوو پایانە نەبوو، ئەوە فڕی بەسەر ئیسلامەوە نییە، جا ناوی خەلافەت بێ، یان پێشەوایی(امامة)، باشترین نموونەی ئەوەش، حوکمڕانیی خەلیفەکانی تورکە لە سەردەمەکانی دواییدا، سەرۆکەکانی دەوڵەت ناویان لە خۆ نابوو خەلیفە و، لە دەوڵەتەکەشیان خەلافەت، بەڵام خۆیان و دەوڵەت و حکوومەتەکەیان، زۆر لە ڕژێمی حوکمی ئیسلامیی دووربوون.

بێگومان لە پێش ئیسلامدا، لە هەموو دنیادا ڕژێمی پاشایەتی‌ی پشتاوپشت، کە کوڕ بە میرات لە بابییەوە بۆی دەمایەوە، باوی بوو و، ئەو جۆرە ڕژێمە چەند نیشانەیەکی هەبوون، لە ڕژێمەکانی دیکەی حوکمڕانیی جیای دەکردنەوە، وەکو ئەوەی کە سەرباری پشتاوپشتیی پاشایەتی، پاشاکان خۆیان پێ لە بەردەستەکانیان بەرزتر بوو و، خۆیان بەسەردا هەڵدەکێشان و، ئەو پاشایانە وا لە زەلکاوی بەزم و ڕابواردندا نقوم بوو بوون، هیمەت ڕووخان و بێڕەوشتی و بەدکارییان لە نێودا باو بوو، کە سەرەنجام زەمینەسازی بڵاوبوونەوەی فەسادی گشتیی بوون.

جا لەبەر ئەوەی ئامانجی ئیسلام چاکەکاریی و بڵاو کردنەوەی یەکسانیی و پەرەپێدانی چاکە و بڵاوکردنەوەیەتی لە نێو خەڵکیدا، ڕقی لە خۆ بە زۆر زانین و خۆ هەڵکێشانە و، لێی قەدەغە کردوون و، مسوڵمانانی ئاگادار کردوونەتەوە کە ئەو جۆرە خەسڵەتانە، بە هیچ جۆرێك پیشەی باوەڕدارانی لە خوا ترس نین: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لاَ يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الأَرْضِ وَلاَ فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ: ئەو ماڵەی دواڕۆژ هەر بۆ ئەوانە دادەنێین کە لەسەر عەرز نایانەوێ خۆ بەزل بزانن و بەدفەڕیی بکەن و، پاشەڕۆژیش هەر بۆ پارێزکارانە.﴾القصص:٨٣.

هەڵبەت ئیسلام ڕاوێژی هێناوە و، لەسەر مسوڵمانانی فەڕز کردووە و، لەسەری پێویست کردوون هەموو ئیش و کارێکیان بە ڕاوێژ بێت : ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ: کاروبارییان لەنێوخۆدا بە پرس و ڕایە﴾شوری:٣٨.. ڕاوێژیش وا دەخوازێت نەتەوە، سەرۆکی دەوڵەت هەڵبژێرێت و، هەر کاتێك شتێکی لێ ڕوودا شایانی لێخستن بێت، لێی بخات و، هەر ئەوەندە بۆ خۆی، پێچەوانەی پشتاوپشت بوونی حوکمڕانی یە لە ڕژێمی پاشایەتیدا.

جا لەبەر ئەوەی ڕژێمی فەرمانڕەواییی پاشایەتیی، کاتێك ئیسلام هات، پشتاوپشت بوو و، خۆی بەسەر خەڵکدا هەڵدەکێشا و پڕ بوو لە فەساد و خراپە، مسوڵمانان پێیان خۆش نەبوو ناوی پاشا لە خۆیان بنێن و، یەکەم کەس کە ڕقی لەو ناونانە بوو، پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەوەتا لەو زاتەوە گێڕراوەتەوە، کە جارێك کابرایەك لە پێشی ڕاوەستا بوو، دەلەرزی، ئەویش پێی فەرموو: ((لەسەرەخۆ بە، ئەمن نە پاشام و نە دیکتاتۆر!)) و، جێنشین و خەلیفەکانی دوای خۆشی هەروا بوون، تا ئەو کاتەی موعاویە بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، ئیدی هاوەڵانی پێغەمبەر و شوێنکەوتووان(تابعون)، دەستیان بە ڕەخنە گرتن لە موعاویە بە تایبەتی و هەموو (بەنی ئومەییە) کرد، کە ئیسلامیان کردۆتە پاشایەتی گەزۆك(عضوض) و ستەمکار و حکوومەتی

کیسرایی، یان هەرقلی-کە پاڵیان دەدایە لای ((کیسرا))ی شای فارس و، ((هەرقل))ی پاشای ڕۆم- جا ئەگەر جیاوازیی نێوان حوکمی ئیسلامیی لە سروشتی خۆیدا و، ڕژێمی حوکمی پاشایەتی لە بارودۆخە جێگیرەکانیدا، وای لە مسوڵمانان کردبێت پێیان خۆش نەبێت ناو لە فەرمانڕەواکانیان بنێن پاشا و، لە ڕژێمی حوکمڕانیش پاشایەتی، هەر ئەوەش وای لێکردوون بە دوای ناوی دیکەدا بگەڕێن و، لێرەدا دەقەکانی قورئان فریایان کەوتوون و ناوی دڵخوازی داونێ، جا ناویان لە ڕژێمی فەرمانڕەوایی ناوە خەلافەت، یان پێشەوایەتی(امامة) و، سەرۆکی دەوڵەتیشیان ناو ناوە خەلیفە، یان پێشەوا(امام).

بۆتە دابیش کە پێشەوایەتی‌ی حوکم ناو بنرێت پێشەوایەتی مەزن(الإمامة العظمى)، بۆ ئەوەی لە پێشەوایەتی‌یەکانی دیکەی وەکو پێشەوایەتی‌ی نوێژ(پێشنوێژیی) جیا بکرێتەوە و، بەو پێیە سەرۆکی دەوڵەتیش ناو دەنرێت پێشەوای مەزن، واتە: ئەو پێشەوایەی لە هەموو پێشەواکانی دیکە گەورەترە.

هەندێکیش پێیان وایە وشەی ((خەلافەت)) بۆ ڕژێمی حوکمڕانیی ئیسلامیی هەڵبژێرراوە و، سەرۆکی دەوڵەت پێی دەگوترێ: خەلیفە، چونکە ئەوەی لە دوای پێغەمبەرﷺ هاتووە، لە سەرۆکایەتیی دەوڵەتدا بۆتە جێنشین(خەلیفە)ی پێغەمبەر ﷺ و جێی وی گرتۆتەوە و، پایەکەشی پێی دەڵێن: خەلافەت، چونکە مسوڵمانان ئەبووبەکریان بە خەلیفەی پێغەمبەری خوا بانگ دەکرد، هەڵبەت ئەوە لە ڕاستیدا شتێکی وا نییە، بەڵام لە ناولێناندا دەقەکانی قورئانیان ڕەچاو کردوون و، لەژێر کاریگەریی ئەو دەقانەدا، ناویان لە سەرۆکی دەوڵەت ناوە خەلیفە و ئیمام و، لەبەر ئەوەی ئەبووبەکریش سەرۆکی دەوڵەت بوو، ئەوە بە گوێرەی دەقی قورئان خەلیفە و ئیمام(پێشەوا) بووە و، لە هەمان کاتدا

جێنشین(خەلیفە)ی پێغەمبەرﷺ بووە، چونکە لە حوکم کردندا جێی ئەوی گرتۆتەوە.

دەبێ لێرەدا ئەوەش بڵێین کە پێویستە بزانین پێغەمبەرﷺ کە سەرۆکی دەوڵەت بووە، لە هەمان کاتدا هەم پێغەمبەر بووە هەم خەلیفە، چونکە لەبەر ئەوەی سروش(وحی)ی بۆ هاتووە، پێغەمبەر بووە و، لەبەر ئەوەی سەرۆکی دەوڵەت بووە، خەلیفەش بووە، جا ئەگەر یەکێك لە حوکمڕانیدا جێی گرتبێتەوە، ئەوە بۆتە خەلیفەی ئەو، چونکە لە دوای ئەو هاتووە و، ئەویش لە لایەن خواوە بۆتە خەلیفە و جێنشینی حوکمڕانیی..

لە بنەڕەتیشدا هەموو مرۆڤەکان بە گشتیی جێنشینن لەسەر زەوی، چونکە جێگری خوای گەورەن لەسەر زەوی و، لەسەریانە لەو شتانەی داوای کردن و نەکردنی لێ کردوون، بە قسەی بکەن، بەڵام ئەگەر هەر یەکەیان بە تەنها بێت و پێوەندیی بەوانیی دیکەوە نەبێت و، دەستەڵاتێك کۆیان نەکاتەوە بەهێزەکانیان ملی بۆ کەچ کەن و، لاوازەکانیان پەنای بۆ بەرن، ناتوانن وەك پێویستە فەرمانی خوا بەجێ بێنن، هەروا سروشتی کۆمەڵ و پێداویستی یە کۆمەڵایەتی‌یەکان، وا پێویست دەکات حکوومەتێك پێك بێنن کێشە و ئاستەنگەکانیان بۆ هەڵبڕێت و، لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا و، پێداویستی‌یەکانی جێنشینیی سەر زەویی و، جێنشینیی لە حوکمڕانیدا، جێگری هەموانیان بێت.

جا ئەگەر حکوومەت جێگری کۆمەڵ بێت، تا فەرمانی خوایان لە نێودا جێبەجێ کات و، سەرپەرشتیی بەرژەوەندی‌یەکانی کۆمەڵ بکات و، خەلیفە یان پێشەوا، نوێنەری یەکەمی حکوومەت بێت، ئەوە لە ئەرکی جێنشینایەتی(خەلافەت)دا کە بۆ بەجێهێنانی واجبی سەر شانی هەموو کۆمەڵ، کە ڕەچاوکردنی مافی خوا و بەجێهێنانی فەرمانیەتی، دانراوە، هەروا بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکیی خەڵك و پشتگیریی کردن لەوەی بەهێز

ستەم لە بێهێز بکات و، بڵاوکردنەوەی دادپەروەریی و یەکسانیی لە نێویاندا و، ئاراستە کردنیان بۆ یارمەتی دانی یەکتر و هاوکاریی و خێر و چاکە لە جوغزی ئەو شتانەی خوا فەرمانی پێ کردوون و ئەو شتانەی قەدەغەی کردوون، دەبێتە جێگر و بریکاری هەموو کۆمەڵ.

خەلیفەش هەر بەقەدەر هەر کەسێکی دیکەی سەر زەویی، بە جێگری خوای گەورە دادەنرێت و، ئەگەر بشگوترێ خەلیفە بەوەی کە جێگری ئەو کۆمەڵەیە کە جێی دەگرێتەوە، بە جێگری خوا حیساب دەکرێت، ئەوە ڕاست نییە، چونکە لەو بارەدا خەلیفە ناڕاستەوخۆ جێگری خوایە و، لە کاتی دانانیدا ئەوە ڕەچاو نەکراوە کە جێگری خوایە و، کۆمەڵ تەنها بە جێگری خۆی هەڵی بژاردووە و، دەستەڵاتیشی هەر لە جێگرایەتیی ئەو کۆمەڵەی دایناوە و مافی چاودێری و قەدەغەکردنی لە بەزاندنی سنووری جێگرییەکەی هەیە وەردەگرێت و، تەنانەت کۆمەڵ بۆی هەیە ڕێ و شوێن بۆ هەڵس و کەوتەکانی دانێت و، ئەو ڕێگایەی دەبێ لە ئەنجامدانی جێگرییەکەیدا بیگرێتە بەر، بۆی دیاریی بکات و، بنەماکانی جێگریش وا پێویست دەکەن و، ئیسلامیش ئەوەی لەسەر خەڵکی فەرز کردووە، چونکە فەرمان کردن بە چاکە و پشتگیریی کردن لە خراپەی فەرز کردووە، تا نەهێڵێ کاربەدەستان ستەم و دەستدرێژیی بکەن و، لە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانیان، کەمتەرخەمیی بنوێنن، هەروا بۆ چاودێریی کاربەدەستان و خەڵکی لە ئەنجامدانی فەرمانی خوا و جێبەجێ کردنی وەك پێویستە: ﴿وَلْتَكُنْ مِنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنْكَرِ: با لەئێوە کۆمەڵێك پێك بێت بانگەواز بکەن بۆ کاری چاك و، فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێ لە خراپە بگرن.﴾آل عمران:١٠٤. دانانی خەلیفەش تەنها بە هەڵبژاردنی کۆمەڵ دەبێت، ئەمەش لەبەر ئەوە نا کە ئەوە سەرشار(منطلق)ی ئەو پێداویستیيە کۆمەڵایەتیيانەیە کە باسمان کردن، بەڵکو لەبەر ئەوەی

قورئان لەسەر مسوڵمانانی فەرز كردووە، ئیش و كاریان بە ڕاوێژ و پرس و ڕا بێت : ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ: كاروباریان لەنێوخۆدا بە پرس و ڕایە﴾شوری:٣٨.
لەبەر ئەوە دروست نییە كەس بەبێ ڕەزامەندیی كۆمەڵی مسوڵمانان ببێتە فەرمان ڕەوایان و، خەلیفە دەبێ هەر بە هەڵبژاردن بێت لە لایەن ئەو كەسانەوە كە مافی هەڵبژاردنیان هەیە و، دەبێ ئەو كەسەی هەڵیشی دەبژێرێت، بۆ خۆی قبوڵی كات..

هەڵبژاردنی خەلیفەش بەو جۆرە، دەیسەلمێنێ كە خەلافەت پەیمانی جێنشینی و جێگیرییەیە لە نێوان كۆمەڵ و خەلیفەدا و، كۆمەڵ خەلیفە ڕادەسپێرێ فەرمانی خوای بە سەردا جێبەجێی بكات و، لە سنووری بەرنامەی خوادا، كاروباریان بەڕێوەبەرێت و، خەلیفەش ڕازی بێت بە گوێرەی فەرمانی خوا حوكمڕانی كۆمەڵ بكات...

خەلیفایەتیش بە ماوەیەكی دیاریی‌كراوەوە بەند نییە، خەلیفە هەتا زیندوو بێت، مادام فەرمانی خوا بەجێ بێنێ، هەر خەلیفەیە، بەڵام ئەگەر لە فەرمانی خوا دەرچوو، یان خەسڵەتێكی وای تێدا هاتە دیی، بە هۆیەوە شایانی لابردن بێت، كۆمەڵ دەبێ لای بات و یەكی دیكەی لە جێ دانێت و، ئەگەر مردیش، ئەوە حوكمڕانییەكەی دوایی دێت.

## جۆری حكومەتی ئیسلامیی

لە پێشەوە گوتمان حكومەتی ئیسلامیی، حكومەتێكی تاق و بێ وێنەیە و، لە هەموو حكومەتێكی دیكە جیایە و، لە هیچ حكوومەتێكی تری جیهان ناچێت، چ ئەوانەی ئێستا هەن، چ ئەوانەی پێشتر هەبوون و، لە خوارێ ڕوونی

دەکەینەوە کە حکوومەتی ئیسلامیی، دەوڵەتێکی بێهاوشێوەیە و، وەکو هیچ کام لەو حکوومەتانەی دنیا ناسیونی، نییە.

جا حکوومەتی ئیسلامیی، هەروەکو زانیمان، پێویستە لەسەری قورئان بکاتە دەستوور و یاسا و، بەوە پابەند بێت کە حوکمەکانی-کە گۆڕین و دەستکاریی و هەڵپەساردن هەڵناگرن- جێبەجێ بکات، لەبەر ئەوە وەکو ئەو حکوومەتە مل هوڕانە نییە بە هیچەوە پابەند نین، هەروا وەکو حکوومەتە دەستوورییەکان نییە، چونکە حکوومەتە دەستوورییەکان مل کەچی ئەو دەستوور و یاسانەن مرۆڤ دایان دەنێت و، مرۆڤیش بە گوێرەی حەز و ئارەزووی خۆی ڕەفتار دەکات و، ئەو یاسا و دەستوورانەی مرۆڤ دایاندەنێت، قابیلی گۆڕان و دەستکاریی و هەڵوەشاندنەوەن، ئەگەر بێتو حەز و ئارەزووی مرۆڤ وای پێوست کرد، بەڵام حوکمەکانی قورئان، خوا ناردوونی و، هەمیشەیی و یەکجارین و، گوێ نادەنە حەز و ئارەزووی کاربەدەستان و بەردەستانیان، بەڵکو بە دادپەروەریی ڕەفتار لەگەڵ هەردووک لایاندا دەکەن و، لە سنووری دادپەروەریی خاڵیس و پاراستنی بەرژەوەندیی کۆمەڵدا، مافی هەردوولا بە تەواویی دەدەن.

جا بۆ ئەوەی هاوسەنگی یەکە تەواو بێت، دەبێ بزانی کە دەقەکانی قورئان حوکمی گشتیی هێناون و، ڕێبازە گشتی یەکانی حوکمڕانیی و بەڕێوەبردنی دیاریی کردوون و، ئەوەی دیکەی بۆ کاربەدەستان بەجێ هێشتووە، یاسایانی بۆ دابنێن و ڕێکیان خەن، بەڵام ئەو یاسایانە، کە مرۆڤ داینا‌ون، دەبێ ئەوەیان تێدا ڕەچاو بکرێت، کە لە سنووری حوکمە گشتی یەکانی ئیسلام دەرنەچن و، ئەنجامدانێکی وردی گیانی شەریعەتی ئیسلام بن، چونکە ئەو یاسایانە کە کاربەدەستان دایان دەنێن، لە ڕاستیدا هەر دەنگدانەوە و سێبەری

قورئانن و، جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ ئەو یاسایانە هەیە کە مرۆڤ دایان دەنێن و، تەنها بە بیر و بۆچوون و ئارەزوو و بەرژەوەندیی خۆیانەوە بەندن.

جا ئەگەر یەکێك لە دیارترین خەسڵەتەکانی حکوومەتی ئیسلامیی ئەوە بێت کە حکوومەتی ڕاوێژە، ئەوە لە هیچ شتێکدا وەکو حکوومەتە پەرلەمانییەکان ناچێت و هەروا لە حکوومەتە ناپەرلەمانییەکانیش جیایە و، ئەگەرچی بنەمای حکوومەتە پەرلەمانییەکانیش لە جیهاندا ڕاوێژە، بەڵام ڕاوێژ لە حکوومەتی ئیسلامیدا، نە لە شێوەیدا، نە لە جۆریدا، نە لە مەبەستیدا، وەکو ئەو ڕاوێژە نییە کە حکوومەتە پەرلەمانییەکانی لەسەر بنیات دەنرێن.

جا ئەگەر یەکێك لە ئەرکەکانی حکوومەتی ئیسلامیی، بەرپاکردن و جێبەجێ کردنی دینە، بەڵام لە جۆری ئەو حکوومەتە دینییانە نییە کە فیقهی یاسادانان(الفقه الدستوري) پێیان دەڵێت: حکوومەتە تیۆکراتی یەکان، چونکە حکوومەتی ئیسلامیی دەستەڵاتی لە خوا وەرناگرێت، بەڵکو لە خەڵکی وەردەگرێت و، بە قسەی کۆمەڵ نەبێ، نە دەستەڵات وەردەگرێت، نە دەست لە دەستەڵات بەر دەدات و، لە هەموو کار و هەڵس و کەوتەکانیدا، پابەندی ڕای کۆمەڵە و، پابەند بوونی حکوومەتیش بە سنوورەکانی ئایینی ئیسلامەوە، هیچ لەو ئەنجامە ناگۆڕێت، چونکە ئایینی ئیسلام پێش ئەوەی داوا لە خەڵك بکات ئیش بۆ قیامەت بکەن، داوایان لێ دەکات ئیش بۆ دنیا بکەن، تەنانەت لە ئیسلامدا ژیانی قیامەتیش لەسەر ئەو کردەوانەی مرۆڤ لە دنیادا دەیانکات، بەندە و، ئیسلام پێش ئەوەی دین بێت، دنیایە و، پێش ئەوەی ژیانی پاشە ڕۆژ بێت، ژیانی ئێستایە و، ڕاستە ئیسلام چەند سنوورێکی بۆ خەڵك داناوە، نابێ بیانبەزێنن و، چەند حوکم و دەستوورێکی بۆ داناون، دەبێ پێڕەوییان لێ بکەن، بەڵام ئازادیی کارکردنی لێ زەوت نەکردوون و، هەموو کاروبارێکی لە دەست دەرنەهێناون، بەڵکو ئازادی کردوون بۆ خۆیان بیر بکەنەوە و ژیانیان

ڕێك خەن و، ئەو ئامێر و دەستەواژانەی هەیانن، بەکاریان بێنن و، خۆ ڕێکخستن و چاودێریی کردنی بەرژەوەندییە تایبەتی و گشتی یەکانیانی داونەتە دەست خۆیان و، داوای لێ کردوون لە پێناوی پێشکەوتن و بەختیاریی و سەرکەوتنیاندا، چۆنیان پێ چاکە، نەخشەی پاشەڕۆژیان بکێشن.

جا زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین: ئیسلام مرۆڤی لەو شتانەدا کە دەیانکات و لەو شتانەدا کە نایانکات، تەواو ئازاد کردووە و، تەنها بەوەوە پابەندی کردووە کە ژیانی لەسەر چاکەکاریی بنیات بنێت، بۆ ئەوەی بە چاکیی بژیت و، دادپەروەریی و یەکسانیی و خۆشەویستیی و هاوکاریی و هەموو مەبدەئێکی بالای ئینسانیی، باڵ بەسەر ژیانیدا بکێشێت، ئەو مەبدەئانەی کە ئیسلام هێناونی و، هەموو جیهان لاف ئەوە لێدەدات کە کار بۆ جێبەجێ کردنیان دەکات و، ناشتوانێ جێبەجێیان کات، چونکە لە دین دوورکەوتۆتەوە و، کەوتۆتە دوای هەوا و ئارەزوو، ئەو مەبدەئانەی دنیا چاوی ئومێدی تێ بڕیون و، دەزانێ چاکبوونی بەوانەوە بەندە، ئەو مەبدەئانەی ناویان مەبدەئی مرۆڤانەیە و، خەڵکی سەر زەویی، لە ڕێگای ئاسمان و پەیامی پێغەمبەرانەوە نەبێ، هەرگیز نەیانناسیون.

هەڵبەت خوا ڕاوێژی لەسەر مسوڵمانان فەرز کردووە و، کردوویەتە کۆڵەکەی ژیانی گشتی یان، جا ئەگەر حکوومەتی ئیسلامیی، حکوومەتێکی تیۆکراتیی با، ڕاوێژی تێدا نەدەبوو و، خوا لەسەر پێغەمبەری خۆی پێویست نەدەکرد لە ئیش و کاردا ڕاوێژ بە مسوڵمانان بکات: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ: لە کاروباردا پرس و ڕایان پێ بکە﴾ال عمران:١٥٩، هەرچەندە پێغەمبەرﷺ بە هۆی سروش (وحی)ی خواوە، پێویستی بە ڕاوێژی مرۆڤ نییە و، پێغەمبەر خۆی پابەندی ئەو ئەنجامانەی ڕاوێژ نەدەکرد کە پێچەوانەی ڕاو بۆچوونی تایبەتیی خۆی

بوون، هەروەکو لە غەزای بەدر و غەزای ئوحد و زۆر هەڵویستی دیکەدا، کردی.. جا خوا تەنها بۆیە ڕاوێژی لەسەر پێغەمبەری خۆی پێویست کردووە، تا دەستوورەکانی ڕاوێژ بۆ خەڵکی دانێت و، پێغەمبەریش بۆیە خۆی پابەندی ئەنجامەکانی ڕاوێژ کردووە، تا بۆ خەڵکی دوای خۆی ببێتە ڕێ و شوێن و داب و، ئەوانیش پابەندی ئەنجامەکانی بن و جێبەجێی بکەن.

هەروا ئەگەر حکوومەتی ئیسلامیی تیۆکراتی بایە، خەلیفە ئازادیی ڕەهای دەبوو و، هەرچی بیکات و نەیکات، بە کەیفی خۆی دەبوو، بەڵام خەلیفە و هەموو حوکمڕانێکی ئیسلامیی، لەو بابەتانەی دەقیان دەربارە هەیە، بە دەقی قورئان و سوننەت و، لەو شتانەی دەقیشیان لەسەر نیە، بە ئەنجامەکانی ڕاوێژ، سنووری بۆ دانراوە.

ئەگەر ڕژێمی حوکمی دیموکراتیش، لە پێویست کردنی هەڵبژاردنی کاربەدەستان بە ئاگاداریی نوێنەرانی میللەت و، دروست کردنی حوکمڕانیی لەسەر دادپەروەریی و یەکسانیی و ئازاد کردنی عەقڵ و بیری خەڵك، لە ڕژێمی حوکمی ئیسلامیی بچێت، ئەوە ڕژێمی حوکمی ئیسلامیی لەوەدا کە کاربەدەستان و خەڵکی بە هەندێك شتەوە پابەند دەکات، نایەڵێ بە دوای هەوا و هەوەسیان بکەون و، مل کەچی ئارەزوویان بن، لە دیموکراسیی جیایە، هەروا لەوەشدا کە پێوەرەکانی دادپەروەریی و یەکسانیی و خەسڵەتە چاکەکانی مرۆڤ، بە مرۆڤان ناسپێرێ بە کەیفی خۆیان سنووریان بۆ بکێشن، هەندێك جار فرەوانیان کەن و هەندێك جاریش وێکیان بێننەوە و، بیانخەنە نێو قاپێلکی حەز و ئارەزووی خۆیان، بەڵکو ئیسلام بۆ خۆی سنووری چاکە و مەبدەئە ئینسانیەکان دەکێشێت و، پێوەرانیان بۆ دادەنێ و، لەسەر مرۆڤەکانی فەرز دەکات مل کەچی ئەو پێوەرە باڵایانە بن و، ئیسلام بەو کارەی، ژیانی گشتیی لە فەساد و خراپە پاراستووە و، حەز و ئارەزووی زیانبەخشی دامرکاندووە و،

حوکمڕانیی لەسەر بنەماکانی خێر و چاکە، کە هەموو کەس پێی چاکن و ڕێزیان دەگرن و، خۆیان لە پێڕەویی لێکردنیان نابوێرن، دامەزراندووە، بەڵام دیموکراسیی، مرۆڤ بەرەڵا دەکات و بە کەیفی خۆی سنووری هەموو شتێك بکێشێت و، پێوەرەکانی ژیانی مرۆڤ دانێت، لەبەر ئەوە هەوا و ئارەزووی سەرکێشیان وای لێ کردن لە سنوور دەرچن و، سوود و بەرژەوەندیی یان بەسەردا زاڵ بووە و، کۆمەڵە دیموکڕاسییەکان، بوونە چەند کۆمەڵێکی بەرەڵای فاسید و، لە زەلکاوی بێڕەوشتیدا ڕۆچوون و، ڕەوشت و خەسڵەتی مرۆڤانەیان تێدا داوەشا و، وای لێهات دادپەروەریی بە پێوەری خزمایەتی و نزیکیی بپێورێت و، بە بەرتیل و واسیتە نەبێ، ماف نەگاتەوە خاوەن ماف و، ئازادیی فکر ببێتە خۆدارنین لە شەرم و شکۆ و ئایین و ڕەوشت و، تێکدان و ڕووخاندنی هەموو ئەو شتانەی مرۆڤی عاقڵ لە ئاژەڵ و ماڵات جیا دەکاتەوە.

هەروا ڕژێمی کۆماریش هەرچەندە لە بارەی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمارەوە لە ڕژێمی ئیسلامی دەچێت، بەڵام هیچ ڕژێمێکی کۆماریی نییە وەکو ڕژێمی ئیسلامی ڕێ بەوە بدات سەرۆك کۆمار بە یەکجاریی هەتا دەمرێت، هەڵبژێررێت، ئەوە سەرەڕای ئەو جیاوازییانەی نێوان ڕژێمی ئیسلامی و ڕژێمە دیموکڕاسییەکان، کە پێشتر باسمان کردن.

ڕژێمە دیکتاتۆرییەکانیش، لە هیچ شتێکدا لە ڕژێمی ئیسلامیی ناچن، چونکە ڕژێمی ئیسلامیی لەسەر بەیعەت و ڕاوێژ بنیات دەنرێت و، بە گوێرەی چەند سنوورێکی دیاریی کراو لە نێوان کاربەدەستان و خەڵکیدا و، لەسەر دروست بوونی لابردنی کاربەدەست و فەرمانڕەوا پێك دێت و، ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان، ڕێ بە هیچ کام لەو شتانە نادەن.

لەمەڕ ڕژێمەکانی حوکمی پاشایەتیش، ئەوە ڕژێمی حوکمی ئیسلامیی لەوان جیایە، چونکە لە ئیسلامدا فەرمانڕەوایی بە میرات و پشتاوپشت نییە،

بەڵکو خەڵك ئازادە کێی پێ لە هەموو کەس چاکتر و بە توانا ترە، هەڵی بژێرێ و بیکاتە فەرمانڕەوا، بۆ بەڵگەش ئەوەندە بەسە کە پێغەمبەر گەڕایەوە لای پەروەردگاری خۆی، بەڵام هیچ کام لە خزمەکانی نەبوونە جێنشینی، بەڵکو ئەبووبەکر بوو بە خەلیفە، کاتێك ئەبووبەکریش کۆچی دوایی کرد، ئەویش هیچ خزمێکی نەبووە جێنشینی، بەڵکو عومەر جێی گرتەوە و بووە خەلیفە، کە عومەریش کوژرا، عەلی جێی گرتەوە و بووە خەلیفە، کە خزمی عوسمان نەبوو.

لە کۆتاییدا دەبێ بڵێین: هەر کەسێك بڵێت ڕژێمی حوکمی ئیسلامی، وەکو یەکێك لەو ڕژێمانەی حوکمڕانیە، کە کۆن یان تازە لە دنیادا هەبوون، یان هەن، ئەوە زۆر لە خۆی دەکات و، لاف شتێك لێدەدات کە نایزانێت و لە ڕاستیی دوورە، چونکە ڕژێمی ئیسلامیی، ڕژێمێکی تاقی بێوێنەیە کە ئیسلام بەدیی هێناوە و، کەسیش هەوڵی نەداوە لەو کارەدا لاسایی مسوڵمانان بکاتەوە و، تەنانەت مسوڵمانان بۆ خۆشیان، لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ، تەنها لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدیندا ڕژێم و حوکمی ئیسلامیان جێبەجێ کردووە و، دوای ئەوە حەز و ئارەزووی نابەجێ، ئەو ڕژێمە خوایی یەی کردە پاشایەتی یەکی گەزۆك(عضوض) و ستەمکار، کە لە پەك خستنی حوکمەکانی ئیسلام سڵی نەدەکرد و، لە پێناوی کردنی منداڵکاران و بەدکاران بە فەرمانڕەوا لەسەر مسوڵمانان، هەموو قەدەغەیەکی خوای حەڵاڵ دەکرد.

## ناوەڕۆك

# لە بڵاوکراوەکانی نوسینگەی تەفسیر

## کتێبە وەرگێڕدراوەکانی زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی:

١- معالم في الطريق- سيد قطب/ و: کرێکار-١٤٢٠ك

٢- الله ﷻ- سعيد حوى/ و: سۆران-١٤٢٠ك

٣- العقيدة في الله- عمر سليمان الأشقر/ و: ئارامی گەلاڵی-١٤٢٠ك

٤- عالم الملائكة الأبرار- عمر سليمان الأشقر/ و: ژیوانی گەلاڵی-١٤٢٠ك

٥- عالم الجن والشياطين- عمر سليمان الأشقر/ و: ژیوانی گەلاڵی- ١٤٢٠ك

٦- الرسل والرسالات- عمر سليمان الأشقر/ و: ئارامی گەلاڵی- ١٤٢٠ك

٧- القيامة الصغرى- عمر سليمان الأشقر/ و: ژیوانی گەلاڵی- ١٤٢٢ك

٨- القيامة الكبرى- عمر سليمان الأشقر/ و: ئارامی گەلاڵی- ١٤٢٢ك

٩- الجنة والنار- عمر سليمان الأشقر/ و: ژیوانی گەلاڵی- ١٤٢٢ك

١٠- القضاء والقدر- عمر سليمان الأشقر/ و: ئارامی گەلاڵی- ١٤٢٢ك

١١- مع الأنبياء في القرآن- عفيف عبدالفتاح طبارة(١-٢)/ و: کاوە هاوڕاز- ١٤٢١ك

١٢- منهج التربية النبوية للطفل- محمد نور سويد/ و: سهام بەرزنجی- ڕێدار احمد- ١٤٢٢ك

١٣- مبادئ الإسلام- أبو الأعلى المودودي/ و: عمر ڕێشاوی- جعفرمصطفى- ١٤٢٢ك

١٤- الزواج الإسلامي السعيد- محمود مهدي الأستانبولي (چاپی ٣)/ و: نەوا محمد سعيد- ١٤٢٢ك

١٥- ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين- أبوالحسن الندوي/ و: ئارامی گەلاڵی- ١٤٢٢ك

١٦- المصطلحات الأربعة في القرآن- أبو الأعلى المودودي/ و: احمد محمد قەرەنی-١٤٢٢ك

١٧- المعجزات القرآنية/ سعيد النورسي/ و: فاروق رسول يحيى/ ١٤٢٣ك

١٨- الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والأستشهاد/ د.صلاح عبدالفتاح الخالدي/ و: فاتح سەنگاوی- ١٤٢٣ك

١٩- قصص النبيين للأطفال- أبو الحسن الندوي/ و: ئارامی گەلاڵی-١٤٢٣ك

٢٠- المال والحكم في الإسلام- عبدالقادر عودة/ و: ڕێبوار کوێستانی- ١٤٢٣ك

## له بڵاوكراوه جیاجیاكانی نوسینگەی تەفسیر

١- تەفسیری قورئانی پیرۆز/ م.عثمان عبدالعزیز/(١٥) بەرگە/ ١٤١٥-١٤١٨ك
٢- خەیاڵاتی ماركسیەت/ فازڵ قەرەداغی/ ١٤١٦ك
٣- ئەفسانەی دیموكراسی/ فازڵ قەرەداغی/ ١٤١٩ك
٤- بەرنامەی پەروەردەی منداڵان/ قۆناغی ١، ٢، ٣، ٤/ محمد سینەمۆكی/ ١٤١٦ك- سێ جار چاپ كراوەتەوە
٥- رونكردنەوەی (العقیدة الطحاویة)/ عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی/ ١٤١٦ك
٦- رونكردنەوەی چل حەدیسەكەی پێغەمبەرﷺ/ عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی/ ١٤١٦ك
٧- تەفسیری سورەتی (نور)/ ئا: ئامینە صدیق عبدالعزیز/ ١٤١٨ك- دوو جار چاپ كراوەتەوە
٨- ئافرەتە ناودارەكانی ئیسلام/ علی صالح كریم/ ١٤١٧ك
٩- خواناسی، ئایین، ئیمان/ علی باپیر/ ١٤٢١ك
١٠- سیستەمی ویندۆس ٩٨/ ئا: ئاراس حاجی مولود/ ١٤٢٣ك
١١- فەرهەنگی ئۆكسفۆرد/ سلام ناوخۆش/ ١٤٢٣ك
١٢- احتلال وتقسیم كوردستان/ سلام ناوخۆش/١٤٢٣ك

## زنجیره ناميلكەيەك:

١- قەیرانی فیكری هاوچەرخ/ د. طه جابر العلوانی/ و: ابراهیم مەلازادە- ١٤١٦ك
٢- رەنگدانەوەی حەقیقەتیباوەڕ/ أبو الحسن الندوي/ و: كامران- ١٤١٨ك
٣- ئیمان یان عەقیدە؟/ فاروق فرصاد- ١٤١٨ك
٤- عەقیدە بەكوردی/ فاروق فرصاد- ١٤١٨ك
٥- ئافاتەكانی زمان/ غەزالی/ و: سۆران- ١٤١٨ك
٦- سەرەتایەك بۆ ناسینی فەرمودە لاواز و هەڵبەستراوەكان/ الألباني/ و: أبو مسلم- ١٤١٨ك
٧- قورئان و زانستی نوێ/ د.مۆریس بۆكای/ و: سەلام ناوخۆش- ١٤١٨ك
٨- سیر و پیاز و رەشكە/ د. دلاور محمد- ١٤١٨ك
٩- دین و شەریعەت/ أبو الأعلى المودودي/ و: احمد ابراهیم وەرتێ- ١٤٢١ك
١٠- ئەدیب و گزیری پۆلیس/ جۆرج بالوشی هۆرفات/ و: محمد هەریری- ١٤٢٢ك

## کتێبە عەرەبیەکان:

١- أصول الفقه الإسلامي في نسيجه الجديد/ مصطفى ابراهيم الزلمي/ ١٤٢١ك- الطبعة السادسة
٢- العلم والأعجاز/ د.دلاور محمد صابر/ ١٤١٨ك
٣- أمراض العصر/ د.دلاور محمد صابر/ ١٤٢١ك
٤- بحوث مقارنة بين العلم الحديث والكتاب والسنة/ د.دلاور محمد صابر/ ١٤٢١ك
٥- المؤامرات الدولية ضد الإسلام/ أم بنان/ ١٤١٦ك
٦- فتوى في حق زوجات المفقودين/ سيد محمد سيد اسماعيل/ ١٤١٧ك
٧- ظاهر السنة والكتاب في حل ذبيحة أهل الكتاب/ سيد محمد سيد اسماعيل/ ١٤١٧ك

## زنجیرەی منداڵان:

١- رۆڵەکانم (شیعر بۆ منداڵان)/ بروا محمدی/ ١٤١٨ك
٢- منداڵی مسوڵمان چی دەڵێ؟/ و: نەوا محمد سعید/ چاپی١(١٤١٩)- چاپی٢(١٤٢٣)ك
٣- مانگا سپاردراوەکە/ ئا: باوکی دیار/ ١٤٢٠ك
٤- شێر دا بۆ داپیر دا/ ئا: ناجح محمد/ ١٤٢٠ك
٥- پەپوی سولەیمان/ ئا: ناجح محمد/ ١٤٢١ك
٦- دار سێو و مانگا/ هـــاژە/ ١٤٢٢ك

## کتێبی داهاتومان،

١- التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن

٢- اصول الفقه الاسلامي في نسيجه الجديد

٣- پیاوانی دەوری پێغەمبەر

**مامۆستای شەهید عبدالقادر عودە لە ساڵی ١٩٥١ لە پێشەکی ئەم کتێبەدا نوسیویەتی:**

بێگومان موسڵمانان لە هەموو شوێنێکی دنیا دا، ئێستا دەربارەی ئیسلام نەزانن و، لە ڕێبازە ڕاستەکەی لایانداوە، تەنانەت لە هەموو جیهاندا وڵاتێک نەماوە، ئیسلام -وەکوو خوا ناردویەتی-ی تێدا جێبەجێ بکرێت، چ لە حوکم و سیاسەتدا، یان لە ئابوریی و کۆمەڵایەتیدا، یان لە هەر شتێکدا پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی تاک و کۆمەڵەوە هەبێت و، سیستەمی کۆمەڵی لەسەر بنیات بنرێت و، داوای چاک کردن و بەختەوەریی بکات.

ئێستاش موسڵمانان لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستیان بە زانینی ڕاستییەکانی ئیسلامە، چونکە ئیمپریالیزم و کۆمۆنیزم تێیان بەر بوون و، دیموکراسی و سۆشیالیزمیان لەبەر چاوان ڕازێنراوەتەوە.. پێویستیان بەو شتەیە تا بزانن تەنها ئیسلام لە ئیمپریالیزم و کۆمۆنیزم قوتاریان دەکات و،تەنها ئیسلامیش دەتوانێ دادپەروەریی و یەکسانی و ئازادیی لە وڵاتەکانیان بە دیی بێنێ..

جا لەسەر هەموو موسڵمانێکی بە توانا پێویستە ئەو حوکمانەی ئیسلام کە لە موسڵمانان شاراونەتەوە، بۆیان ڕوون کاتەوە و بە زمانێکی ئاسان کە تێی بگەن و بە شێوازێکی نوێ قبووڵی کەن، بۆیان بخاتە ڕوو.

* لەبەر گرنگیی و بژاردەیی ئەم کتێبە و جوان ڕون کردنەوەی بۆ چەمکە ئیسلامیەکان (جێنشینی، دارایی، حوکمڕانی)، بە دارشتنێک کە پێشتر بەم شێوەیە نەنوسراوە، دەکرێ ئەمڕۆش ڕوبەڕوی کێشە فیکری و ژیاریەکانی سەردەمی پێبکرێتەوە.

جا لەم سۆنگەوە بەباشمان زانی بیکەین بە کوردی و چاوی خوێنەرانی ئازیزی پێ ڕۆشن بکەینەوە.

نوسینگەی تەفسیر

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی کوردستان
( ٢١١ ) ی ساڵی ٢٠٠٢